# دنیای راستەقینەی دیموکراسی

## سی. بی. مەکفێرسۆن

و. بۆ سەر زمانی فارسی

**عەلی مەعنەوی تێهرانی**

و. لە فارسییەوە

**ئیسماعیل ئیسماعیل زادە**

کوردستان – هەولێر

٢٠٠٥



**ناوی کتێب: دنیای راستەقینەی دیموکراسی**

– نووسینی: سی. بی. مەکفێرسۆن

– وەرگێرانی بۆ سەر زمانی فارسی: عەلی مەعنەوی تێهرانی

= وەرگێڕانی بۆسەر زمانی کوردی: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سدیق

= سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: ١٢٦

–– چاپی یەکەم: ٢٠٠٥

– نرخ: ١٥٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ١٣ – (١١٦)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: 2260311**

**www.mukiryani.com**

# ناوەڕۆك

## پێشەکیی وەرگێڕی فارسی:

دیموکراسی هەر بە گوێرەی مانا قامووسیەکەی (دیموس: خەڵك، کراتووس: سەروەری) و، هەروەها بەپێی ئەو پێناسانەی، کە کولتووورە سیاسییەکان پێشکەشیان کردووە، بەو چەشنە سیستەمە سیاسییە دەگوترێ، کە خەڵك بەڕێوەی دەبەن و لەم روانگەیەوە لە بەرامبەر سیستەمی ستەمکاری و دەسەڵاتی ڕەهای تاکدا رادەوەستێ. ئەم بەرامبەرکێبوونە جەوهەری سەرەکی چەمکی دیموکراسییە، ئەو چەمکەی کە لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا بەشێوەی جیاواز راڤەکراوە. بەدرێژایی کاتی نێوان (دەوڵەت-شار)ی یۆنان و سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا، دیموکراسی تاڕادەیەکی زۆر لەنێو مەیدانی سیاسەتدا ئامادەیی نەبوو و تەنیا لەسەردەمی نوێ و لە ئەورووپا بوو، کە خۆی (دیموکراسی) لەچوارچێوەی ڕەتکردنەوەی حکومەتی سەرەڕۆیی پاشایەتیدا نیشاندا. گەڕانەوەی دیموکراسی بۆ مەیدانی سیاسیی کۆمەڵگاکان و وەگەڕخستنەوەی ئەو چەمکە هاوتەریب بوو لەگەڵ شۆڕشی سەرمایەداری و پێکهاتنی لیبرالیزم-ی سەدەی ١٧ و ١٨، هەروەها لەچوارچێوەی لیبرالیزمدا مانایەکی تازەی وەخۆگرت. لەو روانگەیەوە، کە لیبرالیزم لەسەربنچینەی ئازادیی هەڵبژاردنی تاك دامەزرا، دیموکراسی لە خزمەتی بە بنچینەکردنی ئەم بنەمایە بەکارهات و بەم واتایە تاك ناوەندێتی وەرگرت. لەو کاتەوە تا بە هەنووکە گۆڕانکاری بەسەر ماناکانی تایبەت بە دیموکراسیدا هاتووە، بەڵام روانگەی لیبرال هەروا بەسەریدا زاڵ بووە.

گۆڕانکارییە سیاسییەکانی سەدەی بیستەم توانیان دیموکراسی لەنێو بازنەی رۆژئاوادا بێننەدەرێ و لە شوێنەکانی تری دنیا بڵاوی بکەنەوە. ئەگەرچی لەو شوێنانەدا نەریتی



دیموکراسی هیچ پێشینەیەکی نەبووە، بەڵام هەنووکە دیموکراسی وتەیەکی گشتگیرە و کەمتر سیستەمێکی سیاسی هەیە بەجۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵ دیموکراسیدا هەڵسوکەوت کەن، لەگەڵ ئەمەشدا تەنیا خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم سیستەمانە و دیموکراسی، هەمان وتەی گشتگیرە، کە باڵادەستە بەسەر جەوهەری سەرەکی چەمکی دیموکراسیدا. زۆربەی ئەو حکومەتانەی خۆیان بەخاوەن دیموکراسی دەزانن، زۆرجار بووە کە نوسخەی جیاواز لەم چەمکە پێشکەش بکەن. بەم پێیە ناتوانرێ روون بکرێتەوە کە دیموکراسی چییە و تایبەتمەندییەکانی کامانەن، تەنیا بە قبوڵ کردنی فرەیی لە تێگەیشتن، پێناسە یان بەکارهێنانەکانی. لە راستیدا دەبێ بگوترێ کە دیموکراسی لەم قۆناغەی مێژوودا بەپێی تایبەتمەندییە سیاسییەکانی دنیای ئەمڕۆ، چەمکێکی چەند لایەنە و فرەدەنگییە.

فرەلایەنی چەمکی دیموکراسی زۆر نامۆ نییە. ئەم چەند لایەنیە بەرهەمی راستەوخۆی گۆڕانی بنەما گریمانەییەکانی زانستی دیموکراسی و بنەما سیاسیەکانی تیۆری زانستی سیاسی و پێشکەش کردنی پێناسە مۆدێرنەکانە بۆ ئەو گۆڕانکارییە سەرەکیانەی پێوەندییان بە دیموکراسییەوە هەیە، واتە گەل، دەسەڵات و حکومەت. ئەمڕۆ ئیتر ناتوانین لە چوارچێوەی چەمکی دیموکراسی ئەسینا-ییدا لە مانای ((خەڵك)) حاڵی بین. بەواتایەکی تر لەنێوان پێناسەی کلاسیکیانەی ((خەڵك)) و پێناسەی هەنووکەیی ئەم چەمکە لەڕووی چۆنیەتی و چەندایەتییەوە، جیاوازیی زۆر بەدی دەکرێ.

ئەمەش وەکو ئەوەیە کە ئێستا پێوەندیی نێوان خەڵك و دەسەڵات یان حکوومەت، گەلێ گۆڕانی بەسەر داهاتووە. ئەم پێوەندییە لەسەردەمانی کۆندا یەکسان و راستەوخۆ بووە، ئەوە لە حاڵێکدایە کە لەسەردەمانی مۆدێڕندا هەبوونی پێوەندیی راستەوخۆیان لەگەڵ هاوتای



PDF 4 KURD

نێوان خەڵك و حکوومەت لەزەینیدا ناگونجێ و لەنێوان ئەم دوانەدا ڕێكخراوەگەلێك وەكو نوێنەرایەتیی؛ ئەنجوومەن و سەندیکاکان، حیزبە سیاسییەکان، یەکێتییەکان، باقی ڕێكخراوە مەدەنیەکان دروست بوون، کە لەنێوان خەڵك و حکوومەتەکاندا پێوەندی ساز دەکەن.

لەسەردەمی مۆدێرندا چەمکی هاووڵاتی، ئازادی و خەڵك بەتەواوی لەنێو باسە تیۆرییەکانی تایبەت بەدیموکراسی گۆڕانکاریی بەسەرداهاتووە. ئەم وشانە هاوکات لەگەڵ پاراستنی باری مانایی، بەرفراوان بوونەتەوەو دەلالەت و ئاماژەی جۆراوجۆریان دۆزیوەتەوە. بۆ وێنە لە یۆنانی کۆندا، هاووڵاتی بەهۆی تایبەت بوون بە کۆیەك، کە هاوکات هەڵگری دوو مانای دانیشتوان (خەڵك)، ووڵات بووە، مانا پەیدا دەکا. بەڵام تێگەیشتنی ئەمڕۆی ئێمە لە مانای هاووڵاتی لەسەر بنەمای مافی تاکە کەسی دامەزراوە، کە کۆمەڵگاو یاسا بە پارێزەری ئەو دادەنێن. هاووڵاتیی دنیای کۆن بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەشداریی کاروباری ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی کردووەو لەم ڕێیەشەوە دەستی لە بڕیارو کارە حکوومیەکان وەرداوە، بەڵام وەها دەورێك بۆ هاووڵاتیانی دنیای ئەمڕۆ هەڵناکەوێ. هەر بەم شێوەیەش چەمکی ئازادی گۆڕاوە.

لەچوارچێوەی پێگە چینایەتییەکان و یەکێك لە ئاستەکانی هیرارکیەتی کۆمەڵایەتیدا هاووڵاتیی ئازادی دەوڵەت شارە کۆنەکان بە «ئازاد» دادەنراو لە زەینی ئەواندا کێشەی گشتگیربوونی ئازادی و مافی دیموکراسی بۆ هەمووان، هیچ شوێن و جێگەیەکی نەبوو. کۆیلەکان و ژنان مافی بەشداریکردنیان لە کاروباری سیاسیی حکوومەتیان نەبوو، بەم پێیە لە دەرەوەی سنووری پێناسەی «خەڵك» یان هاووڵاتیە ئازادەکاندا بوون.

بەڵام ئەوەی دیموکراسیی کۆن لە دیموکراسی ئەمڕۆیی جیادەکاتەوە تەنیا بەهۆی جیاوازیی لە چەمکدا سنووردار ناکرێ، بەڵکو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، پێکهاتەی سیاسی، ڕێكخراوەی



کۆمەڵایەتی، گەشەسەندن و ئاڵۆزبوونی سیستەمەکان، ڕەنگاورەنگیی پێکهاتەکان و لە هەموویان گرنگتر دابەشکردنە چینایەتیەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن، سەرەکی ترین سیمای ئەم جیاوازیانە بوون.

دیموکراسی بەمانا نوێیەکەی، زیاتر بەرهەمی شۆڕشی فەڕانسە و تێڕامانی تیۆریك و سیاسییە کە دەسکەوتی ئەو شۆڕشەیە. بیرمەندان و فەیلەسووفە سیاسییەکانی ئەو سەردەمانە وەکو «مۆنتسکیۆ»، «ژان ژاك ڕۆسۆ» و «ئەلێکسی دۆتۆکڤیل» بەگەڕانەوەو دووبارە خوێندنەوەی دیموکراسییە کۆنەکان، نەریتی لەیادچووی دیموکراسییان زیندوو کردەوەو ئەم نەریتە لە توێی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئەورووپادا بوو بە چەمکێکی مۆدێرن. کۆمەڵگا ئەورووپاییەکان بەهۆی میراتی نەریتی سیاسیی ئەسینا، بە وەبەرچاوگرتنی مەودای زەمەنی توانیان بنەڕەتی ڕێكخراوە دیموکراتیەکان لەنێو خۆیاندا بپارێزن، هەر لەبەر ئەوەش بۆ جارێکی تر بوونە سەرچاوەی دیموکراسی.

هەڵبەت ئەم جارە نەریتێکی نوێ هاتە ئاراوە، کە بەبێ ئەو نەریتە سەرمایەداری نەیدەتوانی ڕێگای چەندین ساڵە بپێوێ:

# لیبرالیزم

کاتێ سوونەتی دیموکراسی لەگەڵ لیبرالیزم-ی تازە بەدیهاتوو ئاوێتەی یەکتربوون، تاڕادەیەکی زۆر بە تاکە چوارچێوەی باش و کاریگەر دادەنران. هەڵبەت ئەم ئەندێشەیە توانی هەتا نیوەی سەدەی بیستەم، کە دیموکراسی هێشتا بەقەد ئەم سەردەمە گشتگیرنەببوو، بەرگری لە خۆی بکا. هەتا پێش ئەم جووڵانەوە سەربەخۆیی خوازەو هەنگاونانی جیهانی سێهەم بۆ نێو هەرێمی سیاسەتی جیهانی، کێشەی سەرەکیی دیموکراسیی لیبراڵ لەگەڵ دیموکراسی مارکسیستی یان دیموکراسی جەماوەری بوو. ئەم ناکۆکی و بەرامبەرکێیانە — یانی سێ دەیە شەڕی سارد — هەتا ئەم دواییانەش درێژەی هەبوو. پاش داڕمانی دیواری سۆسیالیزم، دیموکراسیی لیبرال لەلایەکەوە ڕووبەڕووی خستنەڕووی مەسەلەی دیموکراسی لەچوارچێوەی پەرەپێدانی سیاسیی وڵاتە دواکەوتووەکان بووەو لەلایەکی ترەوە لەگەڵ چاوخشاندنەوەو ڕەخنەی لیبرالیزم لەلایەن تیۆریسیەنەکانی وڵاتە سەرمایەدارییەکان بەکێشەهات.

تیۆریسیەنە ناوبراوەکان پاش ڕەخنە و خوێندنەوەی بنەماکانی لیبرالیزم، هەندێ مۆدێلیان لە دیموکراسیی لیبرال پێشکەش کرد. لەم نێوانەدا «کرافۆرد برۆوۆ مەکفێرسۆن» بەسەرەکیترین تیۆریسیەنی دیموکراسیی لیبرال دادەنرێ. ئەو لە کتێبی «ژیان و سەردەمەکانی دیموکراسیی لیبرال»[1] دا چوار مۆدێلی دیموکراسیی لیبرالی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە.

«دنیای ڕاستەقینەی دیموکراسی» کۆی شەش وتارە، کە لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٥ی زایینیدا پێشکەش کراوە. سەردێڕی ئەم کۆمەڵەیە بەشێوەیەکی تاڕادەیەك بەرچاو نیشاندەری چەندایەتیی چەمکی دیموکراسییە و «مەکفێرسۆن» هەوڵی داوە بە بەراوردکردنی چەشنەکانی دیموکراسی، وێنەی ڕاستەقینە لە وێنە ناڕاستەکان جیابکاتەوە.



**پرسیاری سەرەکیی نووسەر ئەوەیە:**

ئایا دیموکراسیی لیبرال، ئاکامی ڕێگای ئەو دیموکراسییانەیە کە تیۆریسیەنە مارکسیستەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم ئاراستەیان کردووە؟ بەسەرنج دان لە شەپۆلی دیموکراسی لە جیهاندا، ئایا دیموکراسیی لیبرال ناچار دەبێ خۆی لەگەڵ مۆدێلە نالیبرالییەکان ڕێکبخا یان بەپێچەوانە؟

«مەکفێرسۆن» دیموکراسیی هاوچەرخ بە دوو دەستەی لیبراڵ دابەش دەکا و لەسەر ئەم باوەڕەیە کە لە چەمکی دیموکراسیدا دوو گۆڕانکاریی بنەڕەتی ڕوویان داوە:

یەکیان لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا و لەدوای سەرهەڵدانی لیبرالیزم، ئەویتریان لە وڵاتە سۆسیالیستەکان و جیهانی تازە گەشەسەندوودا. بەپێی شیکردنەوەی مەکفێرسۆن، دیموکراسی لە کۆمەڵگای دەستەی دووەمدا لە واتای لەمێژینە و کۆن نزیکترە.

دیموکراسی لە بلۆکی ڕۆژهەلات و وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، چووە نێو بیچمی شۆڕش و جووڵانەوەی سەرمایەدارییەوە. لەم وڵاتانەدا حکوومەتە شۆڕشگێڕەکان دیموکراسی بەمانا کۆنەکەی دەناسن، واتە حکوومەتی خەڵکی یان حکوومەتی لەبەرژەوەندیی خەڵکیدا و مەبەست لە خەڵك، چینی زەحمەتکێش و هەژارە. ئەم چەمکە لە دیموکراسی زۆربەی جەماوەر لەخۆدەگرێ. بەڵام تەوەری دیموکراسیی لیبرال لەسەر تاکەکەس دامەزراوە. کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان، کە لەسەر سیستەمی ئابووریی لیبرال، واتە ئەو سیستەمەی لەسەر بنەمای بازاڕی ڕکەبەرایەتی دامەزراوە، بەر لەبەخشینی مافە دیموکراتییەکان، توانیبوویان ئازادیی هەڵبژاردن و بەرابەری کەڵك وەرگرتن لە کەرەسە و بوارەکانی گەشەسەندنی ئابووری بە جەماوەر ببەخشن. دوای ماوەیەك کۆمەڵگای دانراو لەسەر بازاڕ

خوازیاری مافی دەنگی دیموکراتیك بوو، هەتا لە بازاڕی سیاسەتدا بەشێکی هەبێ و بەم شێوەیە بوو کە دیموکراسی بە لیبرالیزمەوە لکێندرا. بەباوەڕی مەکفێرسۆن دیموکراسی لەپێخەفی لیبرالیزمدا سەری هەڵێناو لیبرالیزمی وەکو تەواوکەری لۆژیکی ئەو کۆمەڵگایەی کە لەسەر بنەمای رکەبەرایەتی ئابووری دامەزراوە، عادڵانەتر بکا، لەم کۆمەڵگایانەدا دیموکراسی نە تەنیا بەرامبەر بە لیبرالیزم دانەنرا بەڵکو لیبرالیزمی بەهێزتر کرد.

بەڵام دووهەم وەرچەرخانی ئەم چەمکە، لە تیۆری مارکسیستیدا ئەنجام درا. بە بۆچوونی مەکفێرسۆن، تێگەیشتنی مارکسیستی لەمەڕ دیموکراسی لەسەر بنچینەیەکی ئەخلاقی راوەستاوە. مارکس دیموکراسیی خەڵکی بە قۆناغی دۆخی حکوومەتی پڕۆلیتاریا یان دیکتاتۆریی پڕۆلیتاریا دەزانێ. بەباوەڕی مارکس دیموکراسی هەمان حکوومەتی چینایەتیە بەڵام بەم جیاوازیەوە، کە لەم سیستەمەدا چینی بەرهەمهێنەر حکوومەت دەکا و هێزی خۆی بۆ لەناوبردنی سەرمایەداریی وەگەڕدەخا. دوا مەبەستی چینی کرێکار، پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی بێ چینە. ئەم دیموکراسییە جەماوەریە (راستەوخۆ) هەمان تێگەییشتنە کۆنەکەیە لەمەڕ دیموکراسی، کە مارکس بەشێوەی مۆدێڕن ئاراستەی کردووە. مەکفێرسۆن بە ئاماژەکردن بەو خاڵەی کە مارکس ئەرکی چینی کرێکاریی وڵاتە سەرمایەدارییەکانی روون نەکردۆتەوە، بۆچوونی ئەو (مارکس) دەخاتەبەر رەخنە و لێکۆڵینەوە. هەروەکو ئەوەی کە مێژووی گەشەی سەرمایەداری دەریخست لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا چینی کرێکار پاش بەدەستهێنانی مافی دەنگی دیموکراتیك بە ئاراستەی رووخاندنی سیستەمی سەرمایەداری کاری نەکرد، بەڵکو بەتەنیا پێگەی خۆی لەنێو ئەو سیستەمەدا بەهێزو تۆکمە کرد.



دوای یەکەم ئەزموونەکانی دیموکراسی، لێنین چاوی بەسەر چەمکی دیموکراسی مارکسیستیدا خشاندەوەو بەهێنانە ئارای بابەتی حکوومەتی پێشەنگ یان حکوومەتی چینی پێشڕەو، شێوە چاکسازیەکی لەنێو دیموکراسیدا گرتەبەر. مەکفێرسۆن دەپرسێ:

ئایا وەها حکوومەتێك لەجیاتی ئەوەی لەلایەن خەڵکەوە بێ، لە خزمەت خەڵك دابێ، دەتوانێ بە دیموکراتیك دابنرێ؟ جگە لەمەش هەر لە بنەڕەتدا چۆن حکوومەتی تاك حیزبی وڵاتە سۆسیالیستەکان دەتوانن دیموکراتیك بن؟ بە بۆچوونی ئەو ئەگەر وڵاتە سۆسیالیستەکان سەرنجیان بەوێنەی گشتگیری دیموکراسی یان دیموکراسیی لیبرالی رۆژئاوا بدابوایە و سەرنج و توخمە پۆزەتیڤەکانی ئەویان وەخۆگرتبوایە، لە دیموکراسی راستەقینە نزیکتر دەبوونەوە. ناوچە دواکەوتووەکانیش ماوەیەکی زۆر لەژێر کاریگەریی جووڵانەوە سۆسیالیست و مارکسیستەکاندا بوون و بەم هۆیە لەم ناوچانە وێنە تیۆرییەکەی دیموکراسی ئیلهامی لە وێنەی مارکسیستی وەرگرتووەو لە تێگەیشتنی دیموکراسی جەماوەریدا خاڵی هاوبەشیان هەبووە. بزووتنەوەی رزگاریخوازی، شۆڕشەکان و سەرهەڵدانی سەربەخۆیی خوازانە لە چەند شوێنی ئاسیا و ئافریقا لەسەر بنچینەی ئەم تێگەییشتنە بۆ دیموکراسی ئەنجام دران. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دیموکراسیی جیهانی سێهەم لەگەڵ هەردوو چەشنی لیبرال و چەپ جیاوازیی هەبوو. بە بۆچوونی مەکفێرسۆن لە کولتووری سیاسیدا میللەتانی جیهانی سێهەمی چەشنێ لە دیموکراسییان وەرگرتووە، کە لە کۆمەڵگای پێش شۆڕشی پیشەسازیدا سەری هەڵدابوو، چەمکی دیموکراسی لەلای ئەم نەتەوانە پڕ تەمەنترە و لە دیموکراسیی کۆن نزیکترە.

لەم وڵاتانەدا پێویستیی بەربەرەکانی کردن بۆ وەچنگهێنانی سەربەخۆیی، بناغەی سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی جەماوەریی داڕشت، کە بەڕێبەرایەتی حیزبێکی دەسەڵاتدار یان تاکە کەسێك بوو. لەم وڵاتانەدا ئەم بناغەیە بوو بەهۆی ئەوەی کە دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان

لە روانگەی پێکهاتەی سیاسییەوە، تاک حیزبی یان خاوەنی حیزبێکی زاڵ بن. لەراستیدا ویستی زۆربەی جەماوەر بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی وەکو ئامانجێکی نەتەوەیی دەدرا بەو حیزبەی کە توانای خۆی بۆ یەکگرتوویی و چۆن رۆیشتن بەرەو ئەو مەبەستەی نیشان دەدا، بەم شێوەیە ژمارەیەک حکوومەتی شۆڕشگێر سەریان هەڵێنا، کە زۆربەی خەڵک لایەنگریان دەکردن و وەکو نیاز هەستیان بە بوونی حیزبە نەیارەکان نەدەکرد. مەکفیرسۆن بەم ئاکامە دەگا کە لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا فرە دەنگی و سیستەمی حیزبایەتی لە پێویستییەکی ناوەکی سەرچاوە ناگرێ، چونکە دژایەتی هەر تاقم و دەستە یان، حیزبێک لەگەڵ حیزبی دەسەڵاتدار بە خەیانەت کردن لە وڵات و هەڕەشەیەک بۆ سەربەخۆیی دادەنرێ. لەم کۆمەڵگایانەدا، دایم ترس لەسازبوونی هەڵسوکەوتی ئیستیعماری نوێ لە ئارادا بووەو هەرچەشنە جووڵانەوەیەک دژ بە حیزبی دەسەڵاتدار بەلادان لە ناسنامەی نەتەوەیی و سەربەخۆیی وڵات دادەنرێ. ئەم هەلومەرجە لە شۆڕشە لیبرالییەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدەدا بەدی نەکراوە. بەم پێیە لەو سیستەمە سیاسیانەی تازە بەسەربەخۆیی گەییشتوون، لایەنی زاڵ لایەنێکە نالیبرال، کە لە شۆڕشێکی جەماوەریدا بەرێبەرایەتی ئایدیالۆژیایەکی پڕ هێز سنووردار دەکرێ.

حکوومەتە نوێیەکان لەو وڵاتانەی تازە بەسەربەخۆیی گەییشتوون بەرهەمی ئەو جووڵانەوە دژە ئیستیعماریانە بوون، کە لەژێر رێبەرایەتی هێزێکی پێشڕەودا خۆیان گرتووە. ئەم حکوومەتانە پێکهاتەی چینایەتیان نییە و لەم روانگەیەوە لەگەڵ حکوومەتە سۆسیالیستەکان جیاوازییان هەیە. لەم شۆڕشانەدا لایەنی جیاکەرەوەی چینی پێشڕەو لە جەماوەر جیاوازیی چینایەتی نییە، بەڵکو هۆشیارییەکی سیاسی بەرزترە، ئەم تێگەییشتنەش تێگەییشتنێکی نەتەوەییە نەک چینایەتی. لەم وڵاتانەدا دیموکراسی،



کەرەسەو ئامرازی گەییشتن بە مەبەست نییە، بەڵکو خودی خۆی (دیموکراسی) مەبەستە. ئەم تێگەییشتنە بۆ دیموکراسی پەیوەستە بە تێگەییشتن لەسەردەمانی کلاسیک و پێش لیبرال. بە بۆچوونی مەکفیرسۆن تەنیا خاڵی هاوبەشی ئەم دیموکراسییانە لەگەڵ دیموکراسیی لیبرالی رۆژئاوا پێداگریکردنە لەسەر ئامانجی ئازادی و بایەخی مرۆڤایەتی و یەکسانیی. هەروەها لایەنی هاوبەشی نێوان دیموکراسیی جیهانی سێهەم و دیموکراسیی مارکسیستی لایەنی مارکسیزمە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا. ئەو وڵاتانەی لەژێر کاریگەریی مارکسیستیدا بوون زیاترین سەرنجیان بەرەو ئەم لایەنە لە بۆچوونەکانی مارکس بووە. بەڵام شیکردنەوەی چینایەتیی نێو روانگەی مارکسیستی رەت دەکەنەوە. شیکردنەوەی مارکس لەسەر سووکایەتی و چەوساندنەوەی مرۆڤ و هەروەها لەخۆنامۆبوونی تاک لە هەڵسوکەوتی بەرهەم هێنانی سەرماریەداری، دروست وەکو هەلومەرجی بابەتیی ژیانی ستەم لێکراوانی جیهانی سێهەم و کۆمەڵگای ژێر دەسەڵاتی داگیرکەر-ە. ئەم شیکردنەوەیە بە یەکێک لەسەرنج راکێشییەکانی مارکس لە تیۆری شۆڕشگێڕانەی دژە داگیرکەر دادەنرێ.

سەرنج راکێشیەکی تری مارکس ئەوەبوو کە پێیوابوو مرۆڤ دەتوانێ بەشێوەی شۆڕشگێڕانە بەسەر ئەم کەمایەسیەدا زاڵ بێ...

لە نموونەیەکی تیۆریکی جیهانی سێهەمدا، کۆمەڵگاکان بە دوو چینی «چەوسێنەر» و «چەوسێنراو» دابەش ناکرێ، بەڵکو کۆمەڵگا بەتەواوی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی هێزێکی دەرەکی (داگیرکەر) و بەم پێیە هیچ کەلەبەرێکی چینایەتی بەدی ناکرێ. بەم هۆیە لەم وڵاتانەدا شۆڕشی دژە سەرمایەداری شۆڕشێکی چینایەتی (هەر بەم شێوەیەی کە لە بۆچوونی مارکسدا هاتۆتە ئاراوە) نەبووە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی نەتەوەییە، کە دەبێ دەسەڵاتی چینی

داسەپاوی بیانی بڕووخێنێ و ویستی زۆرینە بەجێ بێنێ. بەم پێیە فێرکارییەکانی مارکسیزم لەو کۆمەڵگایانەدا لەکار دەخرا کە کەلێن و دژایەتیی چینایەتی زەق و بەرچاو نەبوو.

مەکفێرسۆن لەوتارێکا لەژێر سەردێڕی «دیموکراسیی لیبرال وەکو سیستەمی دوو چەشنەی دەسەڵات» بە بەراوردکردنی سێ چەشنە دیموکراسی، تای قورسی تەرازوو بە قازانجی دیموکراسیی لیبرال دەزانێ. هەڵبەت ئەو بەدیدێکی رەخنەگرانەوە دەڕوانێتە ئەم باسە و پێی وایە کە هەتا دیموکراسی لە کردەوەدا لاوازیی نیشان دابێ ناتوانێ بانگەشەی ئەمە بکا کە سەرترە یان ئامانجی دیموکراسی بەشێوەی بابەتی بە ئاکام گەییشتووە. مەکفێرسۆن ئاوا ئەم باسە شرۆڤە دەکا کە دەوڵەتی لیبرال توانی دوای جێگیربوون، تایبەت بوونی مافی موڵکایەتی و دەسەڵات لەچنگی کەمینە دەربێنێ و بەسەر گشت خەڵکی کۆمەڵگای دابەش بکا. بەباوەڕی ئەو تەنیا دەوڵەتی لیبراڵ دەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدا.

مەکفێرسۆن پێی وایە کە هێزی تاك بریتیە لە کۆی هێزی فیزیکی و شارەزایی، هەروەها توانایی بەکارهێنانی هێزو پسپۆڕی لە بەرهەم هێناندا. بەم پێیە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا، پێوەندی نێوان جەماوەر بەپێوەندی هێز دادەنرێ، پێوەندیگەلێك کە بەڕادەی خۆی بەشێکی هێزی کاری خۆی لە خزمەت بەشێکی تر دادەنێ. ئەرکی سەرەکی دەوڵەتی لیبرال بەرپرسیارێتی و پتەوکردنی ئەم پێوەندیانەیە و بەم پێیە بە سیستەمی دوو چەشنەی دەسەڵات دادەنرێ.

سیستەمی سەرمایەداری لە لایەکەوە بەرهەمی بەرابەریی هێزی نێوان جەماوەر و لەلایەکی ترەوە ئاکامی نزیك بوونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگایە. ئەندێشەی بەرابەریی کە لە دیموکراسیدا هاتۆتە ئاراوە، هاوتایی کەرەسە و هەلومەرجەکانە بۆ تێگەیشتن لە تواناییەکان



و پێوانەی مرۆڤایەتی، کە لە کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداریدا رەت دەکرایەوە. ئامانجی شۆڕشە لیبرالییەکان ئەوەبوو کە کۆتایی بەنابەرابەری بێنن و کەرەسەی هاوسەنگ و هاوتا بۆ گشت تاکەکان دابین بکەن، هەموو کەسێك دەتوانێ لەم رکەبەریەدا بەشداری بکا، هەموو دەبێ لەم رکەبەریەدا بەشداربن، بەڵام لە مەیدانی رکەبەرییدا هەموو ناتوانن پێگەیەکی هاوتایان هەبێ، چونکە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری، کە لەسەر بنەمای بازاڕ دامەزراوە بەشێك لە جەماوەر خاوەنی سەرمایە و کەرەسەی بەرهەم هێنانن و بەشێك دەست بەتاڵن کە دەبێ بەسەرمایە و کەرەسەی بەرهەم هێنانی دیتران کاربکەن. مەکفێرسۆن ئەم پێوەندیە بە گواستنەوەی بەرەبەرەی هێز لەناو سیستەمی سەرمایەداریدا دەزانێ، بەبێ گواستنەوەی هێز هیچ رێیەك بۆ دابین کردنی هەلومەرجی زۆر بەرهەمهێنان بەدی ناکرێ. ئەمە لۆژیکی کۆمەڵگای سەرمایەداریە. لە تیۆرە ئابوورییەکانی لیبرالدا لایەنگرانی قوتابخانەی سوود یان رەسەنایەتی قازانج، بەم پێش گریمانەیە کە هەموو مرۆڤێك دەیەوێ زۆرترین سوود و بەهرەی پێ بگات، پاساو بۆ سەلماندنی سیستەمی سەرمایەداریی لیبراڵ دەدۆزنەوە. هەروەها ئەو تیۆرانەی مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك دەناسێنن، کە بەدوای موڵکایەتیدا دەگەڕێ یان بەبوونەوەرێکی داگیرکەریان ناسیوە لە خزمەت پاساوکاریی سەرمایەداریی لیبرالدا بەکارهێنراون و مەکفێرسۆن لەو تیۆرەدا بە تێگەییشتن لە دژایەتیە هەنووکەییەکان، دەپرسێ:

چۆن دەتوانین کۆمەڵگایەك لەناوببەین کە لەنێو چوارچێوەی موڵکایەتیدا پێناسەی مرۆڤایەتی کردووەو بە کۆمەڵگایەك بگەین کە مرۆڤ بەپێی هەڵسووڕانی داهێنەرانە دەناسێنێ؟

نووسەر لە دوایین وتار «داهاتووی نزیکی دیموکراسی و مافی مرۆڤ»دا لە بابەت تێکهەڵکێشانی لایەنە نوێ و کۆنەکانی دیموکراسی دەدوێ. بەباوەڕی مەکفێرسۆن، دیموکراسی لە رۆژئاوا ئیتر ناتوانێ بانگەشەی رێبەرایەتی بکا یان تاکە رێبەری جیهان بێ،

چونکە لە جیهاندا دوو چەمکی تری دیموکراسی پێشکەش کراوە، کە لە پەنای دیموکراسی ڕۆژئاوایی درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن. هەردووك مانای مارکسیستی و مانای ڕۆسۆیی لە دیموکراسی کە تایبەتمەندیی ولاتە تازە سەربەخۆکانە، لە خاڵێکدا هاوبەشن: هەردووکیان لەسەر ئەم باوەڕەن کە ئەو کۆمەڵگایەی لەسەر بنەمای بازاڕ دامەزراوە ناتوانێ مافی مرۆڤ و ئازادیی تاك، کە پێویستە بەرابەر بن، پێك بێنێ و لەم ڕوانگەیەوە دووربوونەوە لە بازاڕ-یان خستۆتە نێو بەرنامەی کاری خۆیانەوە. لەم ولاتانەدا زۆر سەرنج بەموڵکایەتیی تاك نادرێ، چونکە لەگەڵ دوو چەمکی ئازادی و بەرابەری لە دژایەتی دایە. ئازادی لەو کۆمەڵگایەی لەسەربنەمای بازاڕی ڕکەبەرایەتیدا دامەزراوە، خۆی ڕەت دەکاتەوە، چونکە وەها ئازادیەك بەبوونی نابەرابەری لە شارەزایی و هێزدا بەو ئاکامە دەگا، کە بەشێکی خەڵك سەرچاوە و سەرمایەو کەرەسەی بەرهەمهێنان بکەنە ملکی خۆیان و مۆنۆپۆڵی بکەن و زۆربەی جەماوەریش بێ بەش بن.

مەکفێرسۆن دەنووسێ، کە هەنووکە بایەخە لیبرالیەکان دەبێ لەگەڵ ئەو بایەخانەی دیموکراسی نالیبرال ڕکەبەرایەتی بکەن. ئەمە لە حاڵێکدایە کە تا پێش ئێستاش ناچار نەبوون ئاوا بکەن. هەڵبەت ڕوانگەی داهاتوو ئەوەیە کە تەکنەلۆژیای بەرهەمهێنان بۆ ولاتانی ناسەرمایەداری بگوازرێتەوە. ئەم ولاتانە دەتوانن ئازادی و ڕەهەندی مرۆڤایەتی قورس و قایم ڕابگرن. لەم حاڵەتەدا دوو جۆری ئەو کۆمەڵگا سەرمایەدارییەی لەسەر بازاڕ دامەزراوە کۆتایی پێدێ. ئەو پێی وایە لە دۆخی نابەرابەریدا بەخشینی ئازادی بە جەماوەر، ڕەتکردنەوەی ئازادیە، چونکە هەرکەس هێز و پسپۆڕیی زیاتری هەبێ، ئازادی و مافی زیاتری دەبێ. ئێمە ناچارین یەکێك لەم دوو ڕێگایانە هەڵبژێرین:



قبووڵ کردنی ئازادی لە هەمانکاتی ڕەتکردنەوەی مرۆڤایەتی بۆ هەمموو کەس بێجگە لە خاوەنی هێز و شارەزایی یان ڕەتکردنەوەی ئازادی بە قازانجی هاوتابوونی کەرەسەکانی مرۆڤایەتی.

بە باوەڕی ئەو، توانای سەرچاوەکانی و بێ سنووری ویستەکانی مرۆڤ، بەرهەمی کۆمەڵگای سەرمایەداریی بازاڕی بووە. بەواتایەکی تر بۆ سەلماندنی هەبوونی سەرمایەداری، پێویست بووە کە زانیاری بەرەو زاڵ بوون بەسەر توانای سەرچاوەکان بچێ و هێزی پێویستی لە خزمەت دابنێ. بەڵام هەنووکە پێویستیمان بەوەها سەلماندنێك نییە. چونکە بایەخە دیموکراتیەکان (ئازادیی بەرابەر و بەدەست هێنانی یەکسانیی ژیانێکی مرۆیی و عەقلانی) بەدەست هاتوون. بزاوتی داهاتوو دەبێ بەرەو پاشەکشەکردنی عادەتیی پێوەندیە ڕکەبەرەکان و گۆڕان لە ئاکار و ئەخلاقی بازاڕ و موڵکایەتی و کۆکردنەوەی ماڵ بێ. ئیتر پێویست نییە ڕۆژئاوا بۆ وەچنگهێنانی دەسەڵات، گەییشتن بە ئازادی زیاتر وەلابنێ و سەروەتە مادییەکان داگیربکا.

مەکفێرسۆن داهاتی ولاتانی لە حاڵی گەشە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ هەڵدەسەنگێنێ و پێی وایە کە ئەم ولاتانە توانا و پێوانەی جێگیربوونی سیستەمێکی سیاسی بەردەوام و دیموکراتیان هەیە. بە بۆچوونی ئەو لە دنیادا ئیتر نفوز و دەسەڵات پەیوەندی بە باشتر بوونی بەرهەمهێنان یان چەك و چۆڵ، نابێ، بەڵکو ئیمتیازە ئەخلاقییەکان دەست نیشانی دەکەن.

## ڕەهەندە کۆن و ئەمڕۆییەکانی دیموکراسی

دیموکراسی چەمکێکی ئاڵۆزە، هەڵبەت ئەم ئاڵۆزییە لەزاتی دیموکراسی یان خەڵك سالاریەوە هەڵناقوڵێ (هەرچەند دەتوانین لەمەڕ ئەم بابەتە زیاتر بدوێین)، بەڵکو هزری ئێمە لەبارەی دیموکراسییەوە تووشی شێلویی بووە. ڕەنگە یەکێ لەهۆیەکانی ئەوەبێ کە ماندوو بووین لە بیرکردنەوەو ڕۆچوون لەبارەی دیموکراسی و لەوەی، کە دەبیستین دیموکراسی تووشی قەیران بووە و لەوەی کە گشت هەوڵەکان بۆ ئەوەن کە وێنەیەکی وردبینانە و ڕوون لە دیموکراسی پێشکەش بکەن. ئێمە زیاتر ئەمە بەڕەوا دەزانین کە خەریکی گیروگرفتەکانی ڕۆژانەو ژیان بین، بەم جۆرە وەکو پێویست لەبارەی ئەم چەمکەوە هەڵوێست ناگرین ئەگەریش لەو چەمکە وردبینەوە ڕەنگە لەبەرئەوە بێ کە ئێمە لەنێو گوتراو و بیستراوەکانماندا لەبارەی دیموکراسییەوە تووشی ئاڵۆزی دەبین، ئەمەش دەتوانێ دیموکراسی-مان لەبەرچاو بخا، هۆیەکی تر ئەوەیە کە خوێندنەوەی جیاوازمان بۆ دیموکراسی هەیە، چونکە مانای ئەم وشەیە زۆر جاران گۆڕانی بەسەرداهاتووەو ڕاڤەی جۆراوجۆری بۆ کراوە.

پێشتر دیموکراسی بە وشەیەکی نەخوازراو و نالەبار دادەنرا. هەرکەسێك چووبێتە قوتابخانەو پێناسەی سەرەکی بە دیموکراسی (حکومەتی خەڵك یان حکوومەت بەپێی ئیرادەی خەڵك) زانی بێ، پێی وابووە دیموکراسی نا لەبارە — حکوومەتێك کە ئازادی تاکی لەناو دەبردو گشت داب‌ونەریتەکانی ژیانی شارستانیەتی ڕەت دەکردەوە — ئەم باوەڕە گشتگیرە هەتا سەد ساڵ لەمەو پێش خۆڕاگری دەکرد. بەڵام لەماوەی تەنیا پەنجا ساڵدا دیموکراسی لەناکاو لەنێو خەڵکدا جێی خۆی کردەوە. هەر کە شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد ڕێبەرانی ڕۆژئاوا



هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو شەڕەیان بە ئامادەکردنی شوێنێ بۆ جێگیربوونی دیموکراسی ڕاگەیاند، هەتا ئەو کات دیموکراسی بەتەواوی لەلایەن ئەو جەماوەرەوە قبووڵ کرابوو کە لە توێژە ڕێزدارەکانی کۆمەڵگا بوون. هەڵبەت باوەڕیان پێی بوو، لەوکاتەوە دیموکراسی هەروا بەشێوەی ئامانجێکی لەبار ماوەتەوەو تاڕادەیەکی زۆر زۆربەی خەڵك خوازیاری دیموکراسین، لە درێژەی ئەم ماوەیەدا شۆڕشگەلێك دژ بەم چەشنە دیموکراسی (لیبرال دیموکراسیی ڕۆژئاوا)یە بە ناوی دیموکراسی پڕۆلیتاریی یان ((دیموکراسی خەڵك)) و هەروەها چەندین چەشنە دیموکراسیی ئافریقایی و ئاسیایی سەریان هەڵداوە. ئەم شۆڕشانە بەشێوەیەکی بەرچاو سیمای دنیایان گۆڕیوە. دیموکراسی بۆتە چەمکێکی تەمومژاوی و فرەمانا و تەنانەت تەواو دژ بەیەك، هەروەها وڵاتە جۆراوجۆرەکان تێگەیشتنی جۆراوجۆریان بۆ دیموکراسی هەیە.

گومانی تێدانییە کە دنیای ڕاستەقینەی دیموکراسی گۆڕانی بەسەرداهاتووەو ئەم ڕەوتەش درێژەی دەبێ. ڕۆژئاوا وردە وردە پێ دەزانێ کە ئیتر ڕێبەرایەتیی جیهان لەژێر ڕکێفی خۆیدا نابێ و ناتوانێ شارستانیەت بە موڵکی تایبەتی خۆی بزانێ. جیهان لەداهاتوودا دروست بەو ڕێگایەدا ناڕوا کە ئێمە (ڕۆژئاواییەکان) تێپەڕمان کردووە. ئەمە گریمانەیەکە کە زۆر سانا وەچنگ نەهاتووە. ئەم بۆچوونە هەتا چەند دەیەی ڕابوردوو بەراست لە قەڵەم دەدرا. زۆربەی وڵاتە دواکەوتووەکان لەژێر دەستی لیبرال دیموکراتییەکاندا بوون و ئەم حکوومەتە دەیانویست داگیرکراوە دواکەوتووەکان بگەیەننە قۆناغێك کە بتوانن دوای سەربەخۆیی بەپێی پرەنسیپەکانی لیبرال دیموکراسی خۆیان بەڕێوەبەرن.

بەڵام لە ساڵی ١٩١٧ ز دا کاتێ شۆڕشی ڕووسیا سەری هەڵدا و یەکێتی سۆڤیەت دامەزرا بەشێکی گرینگ لە دنیا لەسەر هێڵی لیبرال دیموکراسی لایاندا. هەتا پێش شەڕی دووەمی



PDF 4 KURD

جیهانی وا دادەنرا کە ئەم لادانە پێچەوانەی ئاراستەی گەشەسەندنی جیهانی ڕێدەکات و لە ئاکامدا بەرەو وێنەی زاڵ [٣] دەگەڕێتەوە.

لەماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا گشت ئەم بەرەنجامانە گۆڕانیان بەخۆوە بینیوە، یەکێتی سۆڤیەت گەیشتۆتە قۆناغی سەقامگیربوون و پەرەسەندن:

پێگەی ئەم وڵاتە لەشەڕەکاندا و هەروەها پێشکەوتنە تەکنیکییەکانی، توانییان بە تەواوی پێشبینییەکان لە بابەتدا ڕەت بکەنەوە. زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی بوونە هاوڕێی سۆڤیەت و ئیتر لەسەر هێڵی لیبرال دیموکراسی نەبوون، (وڵاتی) چین بەتەواوی لەسەر ڕێی ڕۆژئاوا لایدا و لەو پەڕی ئەم ڕەوتەوە بەشێکی بەرین لە وڵاتە دواکەوتووەکانی ئافریقا و باشوور و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا-ن کە بەسەربەخۆیی گەییشتوون و بەسەرهاتی وڵاتە تاك حیزبییەکانیان لەبەرە. بێجگە لە چەند حکومەت ئەگینا باقی ئەم وڵاتانە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت ڕێك نەکەوتن (باوەڕیش ناکەم کە ببنە هاوڕێی) بەڵام دیموکراسیی لیبرالی ڕۆژئاوا-شیان قبووڵ نەکردووەو لە هەمان حاڵدا خۆیان بە دیموکراتیك دادەنێن.

بەم پێیە دیموکراسی تووشی گۆڕان و ئاڵوگۆڕ هاتووە. ئەو وڵاتانەی باوەڕیان بە لیبرال دیموکراسی هەیە، زیاتر لەمە ناتوانن هیواداربن کە لە داهاتوودا بەڕێوەبەرایەتی جیهان بەدەستەوە بگرن و چاوەڕوانیش نین کە باقی وڵاتانی جیهان لەگەڵ ئەوان ڕێك بکەون. قبووڵ کردنی ئەم باوەڕو بۆچوونە دژوارە، بەڵام ئێمە وردە وردە خووی پێدەگرین و حکوومەتە ڕۆژئاواییەکان بەناچار خۆیان لەگەڵ ڕاستیە نوێیەکان ڕێك دەخەن. بەم حاڵە (ئێمە) لە ڕۆژئاوادا سیستەمێکمان دارشتووە کە بایەخی زۆری بۆ دادەنێین، ئەم سیستەمە توانیویەتی ڕادەیەکی زۆرباش لە ئازادییەکانی تاك، ئاوێتەی حکوومەتی زۆرینە بکا. سیستەمی ئێمە



بێ وێنەیە و هیچ وێنەیەکی هاوچەشنی ئەمە لە جیهاندا نییە و ئێمەش نامانەوێ کە دەسکەوتەکان (لیبرال دیموکراسی) وەلابنێین، تەنانەت ئەگەر پێویستی ژیانی هاوبەش لەگەڵ باقی سیستەمە سیاسییەکانی دنیا لە ئارادابێ.

ئایا ڕۆژئاوا وردە وردە سیستەمی تایبەتی خۆی لەدەست دەدا؟ ئەم سیستەمە چۆن دەپارێزرێ؟

خۆڕاگری و پێ چەقێنی ئێمە بێ کەڵکە، مەگەر ئەوەی دڵنیابین کە پشت ئەستووربن بەشوێنێکی قایم. شوێن و جێگەی دیموکراسی تا چ ڕادەیەك لە حاڵی گۆڕان دایە؟ دواجار ئێمە دەبێ هەتا کوێ ئەم گۆڕانکاریە قبووڵ بکەین و لە کام شوێن و جێگەدا؟ ئایا دەبێ دیموکراسیی لەڕێی ئامانجێکدا بەخت بکەین؟ بنەمای سیستەمی ئێمە بەهۆی ئازادی و تاکەکەس سازدەکرێ؟ ڕوانگەی سیستەمەکانی تر (دیموکراسی نالیبرال) چۆن دەبێ؟ لەم سیستەمانەدا ئایا دیموکراسی بەرەو دیموکراسیی لیبرالی ڕۆژئاوا دەڕوا؟ ئەم دوو ئاراستەیە تا چ ڕادەیەك دەروەستی یەکترن؟ ئایا لە سیستەمەکانی تردا گۆڕان و ئاڵوگۆڕی لەسەر ئەو هێڵەی کە ئێمە دەمانەوێ، پێوەندی بەشێوە گۆڕانکاریی ئێمەوە هەیە؟ ئایا دەتوانین لە هەمانکاتدا کە بە هاکانی دیموکراسیی لیبرال دەپارێزرێن، وەڵامی بانگەوازی دنیای نوێ بۆ پێکەوە ژیان بدەینەوەو بەرەو لای برۆین؟

ئەم پرسیارانەی سەرەوە مەسەلەگەلێکن کە دەبێ بەوردی تاوتوێ بکرێن. بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکان پێویستە بڕوانینە ئەو ڕاستیانەی کە یەکێکیان —پێشتر ئاماژەمان پێکردووە — دیموکراسییەو بەشێوەی گشتی نابێ لەگەڵ دیموکراسیی لیبرالی ڕۆژئاوادا بەراورد بکرێ، بەتایبەت کە ئەو سیستەمە نالیبرالانەی بەسەر یەکێتی سۆڤیەتدا دەسەڵاتیان هەیە و هەروەها وڵاتە دواکەوتووەکانی ئاسیا و ئافریقا چەشنێ دیموکراسی بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، کە

ڕەسەنایەتی مێژوویی زیاتری لەچاو دیموکراسیی ڕۆژئاوادا هەیە...ـ پاشان زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە دەدوێین ـ.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە لیبراڵ دیموکراسیی ئێمە (ڕۆژئاوا) وەکو هەر سیستەمێکی سیاسیی تر بریتیە لە سیستەمی دەسەڵات، یان بەواتایەکی تر وەکو هەر سیستەمێکی دیکە بە سیستەمی دوو جەمسەریی دەسەڵات دادەنرێ. بەم شێوەیە و بەپێی ئەم سیستەمە دەتوانرێ حوکم بەسەر خەڵکدا بژێ، یانی ئەوان لە ئەنجام دانی کارگەلێك پێشیان لێ بگیرێت و ناچاریان بکەین بۆ کارێکی تر. بۆیە دیموکراسی وەکو چەشنێك پێکهاتەی حکوومی، سیستەمێکە کە حکوومەت بەهۆی ئەوەوە دەسەڵات بەسەر جەماوەر و تاقمەکانی نێو دەسەڵات پیادە دەکا. بەڵام لە مانایەکی گشتی تردا حکوومەتی دیموکراتیك لەگەڵ کۆمەڵگا هەڵسوکەوت دەکاو بەڕێوەبەر و چاودێری چەشنێکی تایبەتە لە پێوەندی و هەڵسوکەوتەکانی نێوان خەڵکی کۆمەڵگا و، بەپێی مافی سەروەریی خەڵك، ئەرکی سەرشانیەتی ماف و ویستەکانی هەموو کۆمەڵگا بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەجێ بێنێ، پێوەندیی نێوان دەستە و تاقمەکانی خەڵکیش بە پێوەندیی دەسەڵات دادەنێ (بەپێی ئەم پێوەندیانە)، هەرکام لە توێژەکانی خەڵك کە خاوەنی دەسەڵات و هەلومەرجی تایبەتن بەپێی توانای خۆیان لە دەسەڵاتدا بەشداری دەکەن.

خاڵی سێهەم کە لەلای تاقمێك ڕێزی لێدەگیرێ و تاقمێکی تر دەیانەوێ نەدرکێ، ئەوەیە کە لیبرال دیموکراسی و سەرمایەداری تەواوکەری یەکترن. لیبراڵ دیموکراسی تەنیا لەو وڵاتانەدا بەدی دەکرێ کە سیستەمی ئابوورییان بە تەواوەتی یان کەمتر سەرمایەداریە و، هەڵبەت ئەمەش بێجگە لە چەند وێنەیەکی تایبەتی کە پێوەندی بەسەردەمی هاوچەرخ هەیە، دەنا



زۆربەی وڵاتە سەرمایەدارییەکان خاوەنی سیستەمی لیبرال دیموکراتی ـن. سەیر دەبوو ئەگەر بەم ئاکامە دەگەییشتین کە گفتوگۆی نێوان سەرمایەداری و لیبرال دیموکراسی هەر لەخۆوە هاتۆتە ئاراوەو بەهۆی نزیکایەتیی مێژوویی بەدی هاتووە. دواتر لەم بارەوە زیاتر دەدوێین. کاتێ خاڵە ناوبراوەکان و لایەنە گرینگەکانی ئەوان شی بکەینەوە، لێڵی ئەم تەمومژانەی لە بابەت دیموکراسییەوە بەدەستەوەن، لادەدرێن یان کەم دەبنەوە و لە توێی دیموکراسیدا شوێن و جێگەی ئێمە بە ئاشکراییەکی زیاترەوە دیار دەکەوێ.

ئێستا دەڕوانینە لایەنە جۆراوجۆرەکانی دیموکراسیی کۆن و ئەمڕۆیی. لەسەرەتای باسەکەدا گوتم؛ کە هەتا سەدساڵ لەمەوپێش دیموکراسی بە چەمکێکی نەخوازراو و خراپ دادەنرا و دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ لە لایەن خەڵکەوە پەسندکرا. دواتر ئەم چەمکە لەماوەی پەنجا ساڵی رابوردوودا بوو بە مانایەکی شاراوەو چەند لایەنە. هەروەها ئاماژەم پێکرد کە زۆربەی سیستەمە لیبرالەکانی هەنووکە وای دادەنێن کە دیموکراسی چەمکێکی مێژووییە. چ ڕوویداوە؟ لە چەمکی دیموکراسیدا دوو گۆڕانی بنەڕەتی بەدی دەکرێن؛ یەکیان لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان و ئەویتریان لە یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە تازە پێگەییشتوەکان.

لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا، دیموکراسی هەتا پێش ئەو کاتەی کۆمەڵگای لیبرالیزم قبووڵ بکا و دەوڵەتی لیبرال سەقامگیر بێ، بە ئیمتیاز دانەدەنرا و هیچ شوێن و پێگەیەکی نەبوو. دیموکراسی لەپێشدا وەکو بنچینەیەکی سەرخانی خۆی نیشاندا. دیموکراسی دەبوایە خۆی لەگەڵ ئەو هەلومەرجە ڕێك بخا کە بەرهەمی ئابوورییەکی ڕکەبەرایەتییەو لەسەربنەمای تاکخوازی سەری هەڵدا بوو. ئەو حیزبە سیاسیانەی دژی خەڵکسالاری بوون پەرەیان بەم چەشنە ئابوورییەدا. لەراستیدا خەڵکسالاری لەنێو دەوڵەتی لیبرالدا تەشەنەی کرد

(دیموکراتیزه) و بەدوای ئەودا لیبرالی-ش لەنێو خەڵکسالاریدا پەلی هاویشت (لیبرالیزه). ئەمە یەکێك لەو دوو گۆڕانە گرینگە بوو کە لەنێو خەڵکسالاریدا رووی داو دواتر بەدرێژی باسی لێدەکەین.

بەڵام لە شوێنەکانی تری جیهاندا — لە وڵاتە سۆسیالیستیەکان و ئەو وڵاتانەی لە حاڵی گەشەدان و تازە بەسەربەخۆیی گەییشتوون — دیموکراسی لە بیچمی شۆڕشێکی دژە سەرمایەداریی لیبرالدا هاتە ئاراوە. ئەو جووڵانەوە سیاسیانەی کە لەم بەشەی دنیادا بەدەسەڵات گەییشتن، بە تەواوی خۆیان بەخەڵك سالار دادەنا و هەنووکەش خۆیان بە ئاڵا هەڵگری خەڵك سالاری دەزانن. ئەو چوارچێوەیەی کە ئەمانە بۆ دیموکراسی دەست نیشانیان کردووەو دەیکەن، هەر ئەو چوارچێوە کۆنەی ((حکوم کردنی خەڵك لەسەر خەڵك))ەو مەبەست لە خەڵك چینە هەژار و ژێر دەستەکانە. بەم حاڵە لەم کەمپەشدا چەمکی دیموکراسی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. هەڵبەت ئەم گۆڕانەش لەسەر ئەو هێڵەیە کە لە بەشی لیبرالی سەرمایەداریی جیهاندا رووی داوە. هەتا ئەوکات کە جووڵانەوە دیموکراتییەکان لەنێو وڵاتانی دواکەوتوودا بەهێزبوون، بەرهەمهێنان و پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیای مۆدێڕن، وەها پێشکەوتنێکی بەخۆوە دیت کە بیرکردنەوە لە داهاتوویەکی تایبەت بە جەماوەر و خاوەنی کەرەسەکان بۆ هەمووان ئیتر شتێك نەبوو کە بیری لێ نەکرێتەوە. بەم پێیە لەوەها وڵاتانێکدا دیموکراسی و هەروەها تێگەییشتن لەم چەمکە ئیتر نەك وەکو حکوومەت کردن بە قازانجی توێژێك بەڵکو حکوومەتێك بۆ سەقامگیرکردنی بەرژەوەندیی گشت خەڵکی کۆمەڵگاو توێژە گشتگیرەکان دێتە ئەژمار.

ئەو گۆڕانکارییەی لە دنیادا (بێجگە لە رۆژئاوا) بەسەر چەمکی دیموکراسیدا هاتووە، نامۆتر و تەمومژاویترە لەو گۆڕانکارییەی کە لە رۆژئاوادا ئەم چەمکەی وەخۆگرتووە. بەڵام



گۆڕانکارییەکان بۆ ئەوە دەبێ هەڵوێستیان لەسەر بگیرێ. لە درێژەی ئەم وتەیەی ئێستادا زیاتر باسی ئەو گۆڕانە دەکەم کە لە دنیای رۆژئاوادا هاتۆتە ئاراوەو لە دووبەشی تر کە دوابەدوای ئەم بەشە دێن، چۆنیەتی گۆڕانی چەمکی دیموکراسی لە بلۆکەکەی تردا دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

پێشتر دیموکراسی بە مانای حکوومەتی خەڵکی ژێر دەست (رەشۆکی) بوو و وەکو مانایەکی تەواو چینایەتی دەهاتە ئەژمار، ماناکەشی دەسەڵاتداریی گەورەترین چینی کۆمەڵگا، واتە توێژی هەژار بووە، بەم هۆیەش جەماوەری خوێندەوار، فیۆدالەکان و ئەوکەسانەی کە رێزیان بۆ شارستانیەت دادەنا ترسان و بێزارییان لە دیموکراسی دەردەبڕی. ئەفلاتوون لەسەدەی پێنجەمی پێش زاییندا، دیموکراسیی وەکوو ڕوانگەیەکی یەکسانیی خواز رەتدەکردەوەو بەهەمان شێوە لەسەدەی حەڤدەدا ((کرۆموێل)) Cromwell رەتی کردەوە. تەنانەت لەشەڕی ناوخۆی بەریتانیا (Levellers)یشدا، یەکگرتووە چەپ خوازەکانی ((کرۆموێل)) لەسەربابەتی مافی دەنگدان و ئەوەی کە چ کەسانێك دەبێ مافی دەنگدانیان هەبێ، لە ((کرۆموێل)) جیابوونەوە، دیموکراسی-یان قبووڵ نەکرد. ئەوان تەنانەت نەیاندەزانی کارێك بکەن هەتا ٢/٣ خەڵکی وڵات، کە مووچەخۆر یان یارمەتی گر یان هەردووکیان بوون، بە مافی دەنگدان بگەن. جەماوەری ئەم توێژە وابەستەی توێژەکانی تر بوون و لە سیاسەتدا باوەڕیان بەهیچ دەورو کاریگەریەك نەدەکرد. تەنانەت ((جان ستیوارت میل)) John Stuart mill دمڕاستی سەرەکیی لیبرالیزم لەسەدەی نۆزدەدا، کە بڕوای بە دەورێکی گرینگی جەماوەر و خەڵکی رەشۆکی هەبوو، سیستەمی دەنگدانی پێشنیار دەکرد کە تێیدا چینی کرێکار نەبێتە زۆرینەیەکی کاریگەر.

لە حکوومەتی لیبراڵ دیموکراتی هاوچەرخدا، دیموکراسی بەبێ بەدیهێنانی پێکهاتەی لیبرالی، قبووڵ نەدەکرا. تەواوی ئەو حکوومەتە لیبراڵ دیموکراتیانەی کە ئێمە ئەمڕۆکە دەیانناسین، لە پێشدا بوونە لیبرال و دواتر خۆیانکردە دیموکراتیك. بەواتایەکی تر پێش ئەوەی دیموکراسی هەنگاو بنێتە نێو دنیای رۆژئاوا، کۆمەڵگا و مافی هەڵبژاردن (سیاسی)، کۆمەڵگا و شێوەکانی پێشبڕکێ، و کۆمەڵگا و بەرنامە و گەڵاڵەکانی بازاڕ، خوڵقابوون. ئەم کۆمەڵگاو حکوومەتە بە لیبرال دەناسرا.

روون و ئاشکرایە کە لێرەدا مەبەستی من لە وشەی لیبرال چەمکێکی گشتی و زۆر ئاساییە. لەم وشەیەدا مەبەستی من لە ئاوەڵناوی لیبرال، مانای سەرەکییەتی، یانی ئەوەی کە هەم کۆمەڵگا وەکو سیستەمێکی گشتی و هەم سیستەمی حکوومی لەسەر بنەمای ئازادیی هەڵبژاردن دامەزراوە و پێکهاتووە. لەو کۆمەڵگایەی کە بە چوارچێوەیەکی کامڵ دادەنرێ و لەسەرجەم پێوەندییەکانی نێوان خەڵکی کۆمەڵگاکە جیاوازە لە پێوەندیی سیاسی نێوان ئەوانەی حکوومەت دەکەن و ئەوانەی لەژێر دەستی حکوومەت دان، هەڵبژاردنی ئازاد (یان ئازادی هەڵبژاردن) بنچینەیەکی ناسراوبوو. لەبەرئەوەی ئەم توخمە هەندێ جار لەڕووی تیۆرییەوە راستربوو لەرووە پڕاکتیکیەکەی و زیاتر جەختی لەسەر دەکرا. بەواتایەکی تر زیاتر لایەنی تیۆریکی لەبەرچاوبوو هەتا لایەنی پڕاکتیکی و تاکەکەس دەیتوانی بە ئازادی؛ ئایین، شێوەی ژیان، ئیش و هاوسەری بەرانبەری خۆی هەڵبژێرێ. ئەو ئازاد بوو کە بەباشترین شێوە و گونجاوترین حاڵەت ژیانی خۆی و سەرانسەری پلەوپایەی ئەو ژیانە رێکبخات. ئەم کەسە لە کۆی ئابووری (بازاڕ تەوەری)دا هەڵدەسووڕاو بەرهەم یان خزمەت و هێزی کاری خۆی بە نرخێك پێشکەش دەکرد، کە هەڵوێست گەلێکی سەربەخۆ و ئازادی لە حکوومەت هەڵدەبژارد. بەم شێوەیە تاکەکەس قازانجی پێ دەگەییشت کە دەیتوانی زۆر



بەباشی هەڵیبژێرێ. ئەم کەسە دەیزانی چەند خەرج بکا، چەند پاشەکەوت بکات، پارەکەی بۆ چ شتێك خەرج بکا، لە کوێ بەگەڕی بخات، خەڵکی بەسەرنج دان بەنرخە باوەکان ویستی خۆیان زەق کردەوەو هەروەها ئەم ویستانەش (وەکو بەرهەمهێنەر - بەکارهێنەر) لەسەر نرخەکان کاریگەر بوون. بەم پێیە دەست نیشانی دەکرد کە دەبێ چ بەرهەم بێ، یان بەواتایەکی تر چۆن بەشێوەی گونجاو و لەڕێی جۆراوجۆرەوە کەڵك لە هێزی مرۆڤ و سەرمایەی کۆمەڵ وەرگیرێ.

گشت ئەم کۆیە بەناوی «ئابووریی بازاڕ» دەناسرێ. ئەم چەشنە لە ئابووری، لە قۆناغەکانی تری پێگەییشتن و کامڵ بوونی خۆیدا واتە لە قۆناغێك کە زۆرینەی خەڵك لە بازاڕدا هێزی کاری خۆیان پێشکەش بەخاوەنانی سەرمایە دەکرد، بە «ئابووریی بازاڕ»ی سەرمایەداری دەناسرێ. کاتێ ئەم کەوتە سەرپێی خۆی و لەولاتە پێشکەوتووەکان و لەنێوان سەدەی حەڤدە تا نۆزدەدا خۆی سەقامگیر کرد، بەهێزێکی چالاك و لیبراڵیگەر دادەنرا. ئابووریی ناوبراو نە تەنیا پێکهاتەی ئابووری بەڵکو سەرتاپای کۆمەڵگای تووشی گۆڕانکاری کرد. ئەم کۆمەڵگا نوێیە لەجێی ئەوەی لەسەربنەمای نەریت و پلەوپایە و دابەشکردنی هەژموونخوازانەی کارو پاداشت دابمەزرێت، پشتی بە جووڵانەوەی تاکەکەس، بەڵێننامە و پێوەندیی پاداشت لەبەرامبەر کاری گونجاو و لەگەڵ هەڵبژاردنی ئازادانەی تاکە کەسەوە بەستبوو. هەموو بەرەو ئابووریی بازاڕی ئازاد پەلکێش کران و سەرجەمی پێوەندییەکانی نێوان تاکەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان بوون بە پێوەندیی بازاڕ.

هەتا پێش ئەم قۆناغە خەڵك خۆیان وەکو تاکە کەسێك نەدەدی، بەڵکوو پێیان وابوو کە ئەندامێکن لە چینێکی کۆمەڵگا یان بەشێکن لە کۆمەڵ. لە کۆمەڵگای سوونەتیدا شوێن

و جێگەی تاڕادەیەك سەقامگیریی تاکەکەس، ببووە گرێنتی  ئاسوودەیی ئەو، کەچی لە هەمانکاتدا ئازادییەکی ئەوتۆی بۆ دانەدەنرا. بەڵام ئێستا خەڵك لەڕووی هۆگری یان ترسەوە خۆیان وەکو کەسێکی ئازاد و خاوەنی مافی هەڵبژاردن دەبینن. لەراستیدا ئەم ئازادیەیان بەسەردا سەپاند. پارادۆکسی ناسراوی «ژان ژاك رۆسۆ» بەو مانایەی کە لە کۆمەڵگایەکی تەواو جێکەوتوودا، مرۆڤەکان ناچارن ئازاد بن، تەنانەت ئەمە بۆ خوێندکارانی لقی فەلسەفەی سیاسی دیدێکی ئاشنایە. راستییەکەی ئەوەیە کە پێش ئەوەی «رۆسۆ» وەها حوکمێك لە بابەت مرۆڤەکانەوە بدا، ئەوان ناچاربوون کە ئازادی قبووڵ بکەن. ئازادییەکی نەخوازراو کە «رۆسۆ» لەبارەیەوە دەدوا، پێشەنگ بوو بۆ ئازادییەکی بەناچاری کە پێشتر لەنێو واقیعدا هەوێنی بەستبوو.

ئەو کۆمەڵگایەی لەسەربنەمای مافی هەڵبژاردنی تاکەکەس دامەزراوە، لە چەند لاوە لاواز بوو. یەکێك لەو خاڵە لاوازانە نابەرابەری بوو، چونکە کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری لەسەر بنەمای بازاڕ نایەتە ئاراوە، مەگەر ئەوەی لەلایەکەوە بەشێك لە جەماوەر خاوەنی سەرمایەگەلێکی لە بن نەهاتووبن، لەلایەکی ترەوە خەڵکێکی زۆر هەژار و دەستکورت بن یان سەرمایەکەیان هێندە کەم بێ نەتوانن کاری پێ بکەن و سوودی لێوەرگرن. ئیتر ئەوان ناچارن هێزی کاری خۆیان بخەنە بەردەستی دیتران. ئەم راستییە ئازادیی هەڵبژاردن لاسەنگ دەکا. هەموو ئازادن بەڵام تاقمێك ئازادترن. هەر چۆنێك بێ کارلێهاتوویی و بەهرەداریی سیستەمی سەرمایەداری بە بەراورد لەگەڵ سیستەمەکانی پێشوو باڵا دەستیەکی تایبەتی هەبوو، دەرفەتی پێشکەوتن و گەشەپێدان (و هەروەها دواکەوتن و وەستان) زیاتر دەبوو، هەروەها بەردەوام نایەکسانیی تێدا دەبیندرا. بەم پێیە ئەم ئازادییە نوێیە بەسەرکەوتنێکی



بێ وێنە دادەنرا. هەرچۆنێك بێ سیستەمی نوێ پێ گەییشت و بوو بەهۆی دانانی کۆمەڵگایەکی لیبرالی تاکخواز.

لەم کۆمەڵگایەدا هیچ لایەنێکی دیموکراتی بەدی نەدەکرا. واتە ئێمە چ لە روانگەی بەرابەری و چ لە روانگەی پاراستنی مافە راستەقینەکانی تاك — ەوە دیموکراسیمان نەدەدی، ئەم کۆمەڵگایە تەنیا و تەنیا لیبرال بوو.

مانەوەو چالاك بوونی وەها کۆمەڵگایەك پێویستی بە دەوڵەتێکی بەرپرس، وەڵامدەرو بە بەرنامە بوو. جووڵانەوەو شۆڕشەکانی سەدەی حەڤدەی بەریتانیا، سەدەی هەژدەی ئەمریکا، سەدەی هەژدەو نۆزدە لە فەڕانسە، هەروەها فرە چەشنی شێوە شۆڕشگێڕییەکان لە رۆژئاوا، کە لە نێوان سەدە ناوبراوەکاندا بەکارهێنران، بنەمای سەرهەڵدانی وەها حکوومەتێکی پێکهێنابوو. سیستەمێك دامەزرا کە لەودا حکوومەت کەوتە نێو چەشنێك لە هەلومەرجی بازاڕەوە.

حکوومەت (دەوڵەت) دەبوایە چەند کەرەسەیەکی سیاسی بەرهەم بێنێ (نەك ئەوەی تەنیا بەشێوەیەکی گشتی کەرەسەگەلێکی سیاسیی وەکو نەزم و قانوونی، بەڵکو  چەشنێکی تایبەتی لە کەرەسەی سیاسی بۆ مەبەستی کەسانێ ئامادە بکا کە لە ئاستێکی بەرزترەوە کۆمەڵگا یان بەڕێوە دەبرد) یان ئەو چەشنە لە قانوون و یاسا و رێسا و پێکهاتەی سەرانە بەرهەم بێنێ، کە بازاڕی وەرپێدەخست یاخود هەلومەرجی کاری بازاڕی دەستەبەر دەکرد. هەروەها وادەزانرا کە ئەو چەشنە لە خزمەتگوزارییە حکومییەکان، وەکو پاراستن و تەنانەت پەرەپێدانی هێزە سەربازییەکان، گەشەپێدانی پەروەردەو فێرکردن و تەندروستی و گەشەپێدانی یارمەتیە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت بۆ بەشی پیشەسازی، وەکو یارمەتی بۆ

دامەزراندن و پەرەپێدانی هێڵی شەمەندەفەر، کە هەموو دەتوانن یاریدەی خێراتر بوونی رەوتی پێشکەوتن بدەن. ئەمانە بەشێك لەو کەرەسە سیاسیانە بوون کە لە دەوڵەت دەخوازرا. بەڵام ئەم ویستە لە چ رێگا گەلێکەوە پێشکەش دەکرا؟ حکوومەت چۆن دەیتوانی وەڵامی ئەم خواستانە بداتەوە؟ بەم مەبەستە دەبووایە دەسەڵاتی حکوومەت لەژێر دەستی ئەو کەسانە دابێ، کە لە رێی هەڵبژاردنی دەوریی، پاڵێوراو و حیزبە سیاسیەکانەوە هەڵبژێردراون. پێویست نەبوو هەڵبژاردن، هەڵبژاردنێکی دیموکراتی بێ و بەگشتی دیموکراتی نەبوو. تەنیا ئەوە بەس بوو کە کەسانێکی شیاوو خاوەن مەرج هەڵبژێردرێن.

بۆئەوەی ئەم هەڵبژاردنە سیاسیە بەشێوەیەکی کاریگەرانە ئەنجام بدرێ، بوونی بەشێ لە ئازادیە تایبەتیەکان-ی تر پێویست بوو. لەوانە، ئازادیی کۆبوونەوە یان حیزبە سیاسیەکان، ئازادیی پێکهێنانی ئەو دەستە و تاقمانەی هەنووکە بەناوی گرووپی فشار دەیانناسین و مەبەستیان گوشار خستنە سەر دەسەڵاتە بە مەبەستی وەچنگ هێنانی دەسکەوت و ئەو مافانەی کە بە مافی خۆیانی دەزانن و هەروەها بوونی ئازادیی رادەربڕین و ئازادیی چاپەمەنی، چونکە بەبێ بوونی وەها ئازادییەك، ئازادیی پێکهێنانی حیزب و دەستەکان بێ مانایە. لەراستیدا ئەم ئازادیانە تەنیا تایبەت بە توێژە دەسەڵاتدارەکان نەبوو، بەڵکو دەبوایە بۆ هەموو دەستەو چینێکی نێو کۆمەڵگا وەبەرچاو بگیرێ. مەترسی ئەوەی، کە هەندێ کەس لەم ئازادیانە بۆ داسەپاندنی دەنگی سیاسی خۆیان کەڵکی خراپ وەردەگرن، حاشا هەڵنەگربوو.



## دیموکراسیی نالیبراڵی چەشنی کۆمۆنیستی

ئێمە لە رۆژئاوادا سیستەمێکی سیاسیی تایبەتیمان وەدەست هێناوە، کە لە دەوڵەتی لیبراڵ و مافی دەنگی دیموکراتیك پێك هاتووە، بەڵام نابێ نێوی دیموکراسی لەسەر دابنێین، چونکە ئەم وشەیە نە تەنیا بە مانای جۆراوجۆر بەکارهاتووە، بەڵکو هەر ئێستا لە گشت دنیادا (بێجگە لە رۆژئاوا) مانایەکی تەواو جیاوازی هەیە. کاتێ دەڵێین دیموکراسیی لیبرال، واتە تەنیا مەبەستی ئێمە دیموکراسیی لیبراڵ بێ و هیچی تر.

بەم جۆرە مەبەست لە دیموکراسیی نالیبرال چییە؟ لە وتاری یەکەمدا گوتمان کە لەسەردەمانی رابوردوودا دیموکراسی بەشێوەی چینایەتی لە ئارادابووە، واتە حکوومەتی چینی هەژار و چینی ژێر دەستی کۆمەڵگا. هەر ئەم تێگەییشتنە لە دیموکراسی دواتر بوو بە دروشمی ئەو شۆڕشانەی کە حکوومەتە کۆمۆنیستیەکانیان پێکهێنا و نەتەوەکانی ئاسیا و ئافریقای بەسەربەخۆیی گەیاند. مەبەستم ئەو چەمکەیە کە لە پێناسەی کۆنی دیموکراسی دەچێ. ئەم چەمکانەی چینایەتی بوون، بەڵام ئەم مانایە دروست وەکو پێناسە و مانای سەردەمانی کۆن نییە، چونکە هەر بەوشێوەیەی باسم کردووە، تەنانەت لەم وڵاتە نالیبراڵانەشدا گۆڕان بەسەر مانای دیموکراسیدا هاتووە. دیموکراسی لە چەمکێکی سەرەتایی و بەدوور لە چینایەتی بۆتە چەمکێکی مرۆڤیی چینایەتی، کە تایبەتە بە بەشە روو لە گەشەکانی کۆمەڵگا. ئێستا باسی ئەم گۆڕانکاریە دەکەین.

پێش هەموو شتێك پێویستە ئەمە وەبیر بێنینەوە کاتێ دیموکراسی سەری هەڵداو وەکو چەمکێکی تەواو چینایەتی هاتە ئاراوە، هێشتا مانای بەربڵاوتری لەوە هەبوو. لە راستیدا دیموکراسی لە روانگەی چینە دەسەڵاتدارەکان (چینە باڵا دەستەکان)ەوە چەمکێکی چینایەتی بووە. ئەوە وتەبێژ و راوێژکارانی چینی دەسەڵاتدار بوون کە بۆ یەکەم جار کێشەی سیاسەتی

چینایەتیان زەق کردەوە و داخوازیی دیموکراتەکانیان بەداخوازیی چینایەتی ناساند. توێژی دەسەڵاتدار لەچاو دیموکراتەکان بەردەوام لە بابەت سیاسەتی چینایەتیەوە وێنەیەکی روونتری بووەو هەیەتی. دیموکراسی لە روانگەی توێژی هەژار یان تەنانەت توێژی مام ناوەندیی کۆمەڵگادا، هەرگیز بە بابەتێکی تەواو چینایەتی لە قەڵەم نەدراوە. بە بۆچوونی ئەوان دیموکراسی تەنیا رێیەك نەبووە بۆ رزگاریی ئەوان لە ستەم، بەڵکو شێوەیەك بووە بۆ ئازادیی گشت مرۆڤایەتی و دانانی هەلومەرجێك، بۆ بەئاکام گەیاندنی مرۆڤایەتی... دیموکراسی هەتا ئەو شوێنە بەچینایەتی دادەنرا کە خەڵك پێی وابوو توێژی دەسەڵاتدار وەکو لەمپەرێك لەسەر رێی بە ئاکام گەیییشتنی ئامانجی ناوبراودا رادەوەستا. ئەگەر ئەوان چینایەتی یان توێژتەوەر بوون یان وادەهاتنە بەرچاو کە بەم جۆرە هەڵسوکەوت دەکەن، لەبەرئەوە بوو کە هەلومەرجی زاڵ وای دەکرد کە دەبێ مرۆڤ تەوەر بن نەك توێژتەوەر.

لەم هەل و مەرجەدا دەتوانرێ ئاوا بیر بکرێتەوەو سروشتیە و ئەوانیش لۆمە ناکرێن. لەو شوێنەی حەقیقەتی سەرەتاو ئامادە، سەروەری توێژێك یان دەسەڵاتی هێزێکی بیانی بووە، کە بەکردەوە گشت جەماوەری کۆمەڵگای داگیرکراوی لە خوارووترین پلەی چینی کۆمەڵایەتی رادەگرت. خەڵك ئەم هەل و مەرجەی نەك بە مەبەستی هەڵقوولاو لە چینێك بەڵکو بەکردەوەیەك دادەنا، کە پڕە لە سووکایەتی کردن بە مرۆڤ و سەرجەم مرۆڤایەتی.

ئەم تێگەییشتنە لە دیموکراسی لەچاو دیموکراسیی چەشنی کۆمۆنیستی زیاتر باوە کە دایمە چەمکێکی چینایەتی بووەو تەواو دژ بەو مانایەیە کە لە زەینی جولاّنەوە دیموکراتیەکانی جیهانی سێهەمدایە. بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی وردترمان لەسەر بابەتەکە هەبێ، بەشێوەی جیا ئەم دوو لقە لە دیموکراسیی نالیبرال دەخوێنینەوە. لەم وتارەدا تەنیا چەمکی دیموکراسی لای کۆمۆنیستەکان دەخەمە بەرباس و لێکۆڵینەوە.



تیۆری کۆمۆنیستی لە کارو بەرهەمەکانی ((کارل مارکس))ەوە، کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٤٠ هەتا ١٨٨٠ دایە، سەرچاوە دەگرێ. لەم بابەتەوە دوو خاڵی گرینگ بەرچاو دەکەوێ، کە دەبێ سەرنجیان بدەینێ. یەکەم ئەوەی کە تیۆری کۆمۆنیستی هەر لە سەرەتاوە تیۆرێکی تەواو ئەخلاق خوازبوو. ئەم تیۆرە هەرچەند پێکهاتەیەکی وشك و ساردو بێ رۆحی هەبوو، بەڵام هەڵگری ناوەرۆکێکی ئەخلاقیی بەهێزە، تیۆری هێزی بزوێنەری مارکس لەسەر ئەم باوەڕە راوەستاوە، کە مرۆڤ لە زاتی خۆیداو بەشێوەی ئازادانە بوونەوەرێکی داهێنەرە. دوا بەدوای ئەم تیۆرە بوو کە ئەم باوەڕە سەری هەڵدا هەرچەند بەدرێژایی مێژوو (هەروەها لەپێش مێژووشدا)و بەهۆی جۆراوجۆر مرۆڤ نەیتوانیوە خودی خۆی بناسێ، بەڵام هەنووکە بۆ یەکەم جار هەلومەرجی ئەم ناسینە هاتۆتە ئاراوە. ئەو هۆیانەی پێشی ئەم ناسینەیان دەگرت، بریتی بوون لەوەی کە ڕادەی بەرهەمهێنانی ماددی هێندە کەم بوو کە جەماوەر تەواوی هێزی خۆیان بۆ کاری تاقەتپڕوکێن تەرخان دەکرد و دایمە بۆ رێکخستنی ئەم هێزی کارە، پێویستیان بەدەستە یان توێژێکی دەسەڵاتدار هەبووە. هۆی پێویست نەبوونی وەها توێژێك ئەوەیە کە سەرمایەداری (دوایین وێنە لە سیستەمە چینایەتیەکانی بەرهەم هێنان) هەل و مەرج و تواناییەکی بۆ بەرهەمهێنان دەستەبەر کردووە، کە هەنووکە بۆ یەکەم جار توانیویەتی لە روانگەی تەکنۆلۆژیاوە رزگاریی مرۆڤ لەژێر کاری تاقەتپڕوکێن و دژوار (بە شێوەیەکی تەکنیکی)، مسۆگەر بکا. مرۆڤ بۆ یەکەم جار دەیتوانی بە ئازاد بوون لە کۆت و زنجیری کاری زۆرەملێ و سیستەمی کۆمەڵگای چینایەتی، بەرەو مرۆڤایەتی هەنگاو بنێ. ئەم لایەنە مرۆڤ خوازانەیەی روانگەی مارکس یەکێك لەو دوو خاڵە سەرەکییەیە کە دەبێ بیخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

ئەوەی کە (مارکس) تیۆری سیستەمە سیاسیەکان بە دەروەستی چ شتێك دەزانێ، دوهەم خاڵی جێی سەرنجە کە دەبێ باسی لێ بکەین: ئەو رۆڵەی مارکس بۆکردەوەی سیاسیی

چینێك و پێكهاتە سیاسیەكەی باوەڕی پێی بوو، بۆ گۆڕینی كۆمەڵگا و سەقامگیركردنی كۆمەڵگای ئایدیالی بوو.

لە روانگەی ماركسدا كۆمەڵگای سەرمایەداری، كۆمەڵگایەك بوو تەواو چینایەتی، هەروەها لە شیكردنەوەكانیدا تایبەتمەندیی سروشتی و سیستەمی سەرمایەداری، چەوساندنەوەو بەهرە كێشی بوو. تا كاتێ سیستەمی سەرمایەداری هەیە دەوڵەت كەرەسەیە، كە لە چنگی ئەو هێزانەی هەوڵ دەدەن هێزو دەسەڵاتی چینی چەوسێنەر بپارێزن. بەم جۆرە سەرمایەداری دەبێ بڕووخێ: دەبێ تەنیا هێزە بەرهەم هێنەرەكان بپارێزرێن. ئەم كارە نیازی بەوە هەیە كە دەوڵەتی سەرمایەداری تێك بشكێ و مرۆڤایەتی ئازاد بێ، هەتا هێزی لەناخدا هەڵگر (بالقوە)ێ خۆی بەتەواوی وەگەریان بخا. ماركس پێی وایە تەنیا هێزێك كە بتوانێ دەوڵەتی سەرمایەداری تێك بڕووخێنێ، چینی ژێردەستە واتە پڕۆلیتاریای هۆشیار لەرووی سیاسییەوە. دەبێ ئەم چینە دەسەڵاتی سیاسی وەچنگ بێنێ و سەرجەم هەڵسوكەوتە سەرمایەدارییەكان هەڵتەكێنێ و لەجێی موڵكایەتی تایبەتی و چاودێركردنی چینی سەرمایەدار، موڵكایەتی گشتی لەسەر كەرەسە بەرهەم هێنەرەكان سەقامگیر بكا. بەم شێوەیە حكوومەتی سیاسی هی پڕۆلیتاریا دەبێ و بەهەمان ڕادەی سەرمایەداری دەبێتە خاوەن هێز. ماركس بۆ هەردووك سیستەمەكە، زاراوەی دیكتاتۆریی بەكارهێناوە. دیكتاتۆریی پڕۆلیتاریا لەجێی دیكتاتۆریی سەرمایەداری دادەنیشێ و تا ئەوكاتەی كاری گواستنەوەو ئاڵوگۆڕكردنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەكان كۆمۆنیزمی لێ نەكەوێتەوە، ئەم دیكتاتۆرییە هەروا لەسەرپێی خۆی رادەوەستێ.

ماركس بەم قۆناغەی حكوومەتی پڕۆلیتاریا دەڵێ دیموكراسی، بەڵام لە زەینی ئێمەدا دوو چەمكی دیموكراسی و دیكتاتۆری، وەها دژ بەیەكن كە بەدیموكراسی دانانی ئەم حكوومەتە هەڵتەكێنەرە بۆ ئێمە قبووڵ ناكرێ. هەروەها ناتوانین پێی بڵێین دیموكراسیی لیبراڵ. چونكە هیچ نیشانەیەكی لیبراڵ بوونی تێدا نابینین. بەڵام ئەگەر نێوی دیموكراسی - شی لەسەردانێین



زۆر نامۆ نابێ، چونكە بەكارهێنانی ئەم مانایە لە دیموكراسی، لەنێو چوارچێوەی چەمكی كۆنی (دیموكراسی)دا تەواو سروشتیە. مەبەستی ماركس - یش هەر ئەمە بوو كاتێ لە مانفێستی كۆمۆنیستیی ساڵی ١٨٤٨ ز- دا نووسی كە ((یەكەم هەنگاوی چینی زەحمەتكێش لە شۆڕشدا، بریتیە لە بەدەسەڵات گەیاندنی پڕۆلیتاریا و سەركەوتنی لە شەڕی دیموكراسیدا)) دیموكراسی بە دەوڵەتێكی چینایەتی دادەنرا، دیموكراسی دەبێ هێزی خۆی بۆ لەناوبردنی بناغەكانی سەرمایەداری بەكاربێنێت و هێزە بەرهەم هێنەرەكانی كۆمەڵگا و هەروەها سەرمایە كەڵەكەبووەكان بخاتە خزمەتی تەواوی كۆمەڵگا.

بەڵام خاڵی سەرەكی ئەمەبوو كە ئەم دەوڵەتی چینایەتیە هەر بە هەنگاوی سەرەتا دەزانرا. لە روانگەی ماركسەوە دابەشكردنی توێژەكان بەسەر پڕۆلیتاریا و سەرمایەدار بە دوایین دابەشكردنی جەبریی مێژوو دادەنرا. كاتێ دەوڵەتی پڕۆلتاری، سیستەمی سەرمایەداری بڕووخێنێ ئیتر هیچ چینێك نامێنێ و كۆمەڵگا كێشەی چینایەتی بەخۆیەوە نابینێ، چینەكان لە چەمكی كۆنەی چەوسێنەرو چەوسێنراودا لەناو دەچن و هەر بەم شێوەیەش حكوومەت و دەوڵەتی چینایەتی دەڕووخێت، بەم پێیە بە بۆچوونی ماركس، دیموكراسی چەشنێ حكوومەتی چینایەتییە كە لە گەڵ باقیی ئەم چەشنە حكوومەتانەدا، جیاوازی هەیە، چونكە دوایین مەبەستی (دیموكراسی) دروست كردنی كۆمەڵگایەكی بێ چینە و كۆتایی بە تەمەنی مێژوویی چینەكان دێنێ.

بە كورتی دیموكراسیی ماركسیستی لە هزری دیموكراسیدا لە مێژینەوە سەرچاوەی گرتووە. بەڵام گۆڕانی بەسەر داهێناوە و وردەكارییەكی زیاتری پێ بەخشیوە، لە هزری كۆنی دیموكراسیدا ئەوە دەست نیشان نەكراوە كە چۆن رزگاری چینێك یەكسانە لەگەڵ رزگاری گشت مرۆڤایەتی. ماركس لایەنێكی نوێی پێدا، بەو شێوەیە كە ئەو پێی وابوو دیموكراسی پێوەندی بە پەرەسەندنی مێژوویی سیستەمە بەرهەم هێنەرەكان و بەتایبەت بە سیستەمی

بەرهەم هێنانی سەرمایەدارییەوە هەیە. چینی کرێکار کە لە داوێنی سەرمایەداریدا سەرهەڵدەدا، دەتوانێ بەوەچنگ هێنانی دەسەڵاتی سیاسی، خۆی رزگار بکات. دەسەڵاتداریی ئەم چینە لەو روانگەیەوە دیموکراتییە، کە هەڵگری زۆرینەی مەزنی خەڵکە و مەبەستەکەشی بە مرۆیی کردنی بارودۆخی ژیانە بۆ هەمووان. ئەم دیموکراسییە لەسەرەتادا چینایەتییە، چونکە حکوومەتی چینایەتی، بۆ تێپەڕین لە ئابووریی سەرمایەدارییەوە بەرەو سۆسیالیستی پێویستە. کاتێ گواستنەوەی ئابووری بە دروستی و تەواوی بەڕێوەچوو و هەموو شتێ بۆ خەڵك دەستەبەرکرا، ئیتر نیازێکیان بە حکوومەتی چینایەتی نابێ. بەو شێوەیە رزگارکردنی چینێك دەبێتە هۆی مرۆڤایەتی کردنی گشت کۆمەڵگا و ئەم کارە لە درێژەی قۆناغە دیاریکراوەکاندا بە ئاکام دەگا و شوێنی دەسپێکیشیی وەچنگ هێنان و گواستنەوەی ئەم دەسەڵاتەیە بۆ دەستەی پڕۆلیتاریا.

هەروەك هەموومان دەزانین، ئەوەی کە مارکس چاوەڕوانی بوو رووی نەدا. چینی کرێکار لەنێو پێشکەوتووترین وڵاتانی سەرمایەداریدا، هاوتەریب لەگەڵ گەشەی هۆشیاری سیاسی و چینایەتی و وەچنگ هێنانی مافی دەنگ دان توانی بەدەسەڵات بکا. چینی ناوبراو بە بوونی دەسەڵات سەرمایەداریی رەت نەکردەوە بەڵکو بۆ تۆکمەکردنی پێگەی خۆی لەنێو سیستەمی سەرمایەداریدا، کەڵکی لێ وەرگرت خەباتی پڕۆلتاری لەنێو وڵاتێکدا سەری هەڵدا کە تەنیا ماوەی چەند دەیە بوو هاتبووە نێو پانتایی سەرمایەدارییەوە. لەم وڵاتەدا چینی کرێکار بە بچووکترین چینی ناو کۆمەڵ دادەنرا، چینێك کە وەکو دورگەیەکی بچووك لەنێو زەریایەك لە جووتیاراندا ون ببوو.

((لێنین)) رێبەری شۆڕشی ١٩١٧-ی رووسیا، بە باشی دەیزانی کە لە خشتەی زەمەنی مارکسدا هەڵە بەدی دەکرێ. لێنین-یش وەکو مارکس پێی وابوو کە سەرمایەداری شەرمەزاری لەناوچوونە، تاکەرێیەکی کە ئەم لەناو چوونە دەستەبەردەکا، خەباتی پڕۆلتاری و



گواستنەوەی دەسەڵاتە بۆ دیکتاتۆریی پڕۆلیتاریا، و دواجار بە کۆمەڵگایەکی بێ چینایەتی کۆتایی دێت. بەڵام ئەو (لێنین) بەم دەرەنجامە گەییشت کە لە سیستەمی سەرمایەداریدا خودی چینی کرێکار هەر ئەوەندە دەتوانێ کە بە هۆشیارییە یەکێتیەکان(٤) بگا.

بەم جۆرە دەبوایە چ بکرابایە؟ لە سەرەتای ساڵی ١٩٠٢دا لێنین باسی لەوە کرد کە خەباتی پڕۆلتاری دەبێ لە لایان چینێکی پێشڕەوەوە بێت و وەکو کەمایەتییەکی هۆشیاری چینایەتی ئاڵای خەبات هەڵبگرێ. کاتێ چینی پێشەنگ بتوانێ شۆڕش بە ئاکام بگەیەنێ، باقی کرێکارانی تریش بەدوای خۆیدا رادەکێشێ. بارودۆخی وەها شۆڕشێك لە ئوکتۆبەری ١٩١٧ لە رووسیادا دەستەبەر بوو. ئەوکات دەوڵەتی لیبرالی سەرمایەداریی مەشروتە-یی دەسەڵاتی لە حکوومەتی رزیو و لەرزۆکی تێزار-ی بەمیرات وەرگرتبوو، کە بەکردەوە لە بەرامبەر بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایەك تووشی داماوی هاتبوو کە لە روانگەی چینایەتییەوە شەڕ لێدراو و هەڵوەشاوە بوو.

بەم شێوەیە یەکەم شۆڕشی کۆمۆنیستی بەناوی چینێکی کۆمەڵایەتی (چینی کرێکار) و بەرێبەریی چینی پێشڕەو، سەری هەڵدا. دەوڵەتی سۆڤیەت هەر لەسەرەتاوە کەوتە دەستی ئەم چینە، واتە بە تەواوی کەوتە چنگی حیزبی یەکگرتووی کۆمۆنیست — ەوە، کە لەژێر چاودێریی ناوەندی دەسەڵاتدا بوو. ئامانجەکانی ئەم حیزبە هەر ئەو ئامانجە مارکسیست-یانە بوو، واتە کەڵك وەرگرتن لە هێزی دەوڵەت بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری بەرەو کۆمەڵگایەکی بێ چینایەتی. بەڵام لە کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشدا هێشتا بنەما ماددییەکان نەهاتبوونە ئاراوەو دەبوایە ئامادە بکرابونایە، مارکس جەختی لەسەر هێزی بەرهەمهێنانی نێو سیستەمی پێشکەوتووی سەرمایەداری دەکرد. لە سۆسیالیزمدا دەبوایە ئەم ژێرخانە بەهێز بکرابوایە چونکە بەرهەم هێنانی ماددیی بەرز دەکردەوە، بە بڕوای مارکس بەبێ بوونی ئاستێکی بەرزی ماددیی بەرهەم هێنانی ماددی هیچ هیوایەك بۆ پێکهێنانی

کۆمەڵگایەکی بێ چین لە ئارادا نییە. مێژووی حکوومەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩١٧ بەدواوە مێژووی ئەم تێکۆشانەیە کە بێ وچان بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەمایەتی و هەروەها راکێشانی خەڵك بەرەو سیستەمی سۆسیالیستی، لە ئارادابووە و هەروەها هەوڵێك بووە بۆ وەچنك هێنانی پێگەیەك لەنێو جەماوەردا.

هەر لەسەرەتاوە رێبەرەکان لەوە تێگەیشتن و بەوەیان زانی کە پێویستە دیموکراسییەکی بنەڕەتی دابڕێژرێ. قەت ناتوانرێ بۆ هەمیشە پشت بەچینێکی پێشڕەو ببەسترێت، چینێك بە تەنیا ناتوانێ ئاڵوگۆڕ بەسەر کۆمەڵگادا بێنێ. بەم حاڵە ئەگەر بڕیاری کۆمەڵگا بگۆڕدرێ، پێویستە زۆربەی جووتیارە دواکەوتووەکان بەسەردەمی مۆدێرن بگەن و بەشی گەورەی چینی کرێکار لە شێوەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنان بێنەدەرێ و بەرەو دروست کردنی کەرەسە سەرمایەکانی پێویست هان بدرێن چونکە وەها سەرمایەیەك زامنی ستاندارێکی بەرزە بۆ بەرهەم هێنان.

لە ئاکامدا حکوومەتی- سۆڤیەت هەنگاوێك لە چەمکی دیموکراسیی مارکسیستی دوورکەوتەوە. ئەم حکوومەتە لەجێی ئەوەی لە دیموکراسی چینایەتییەوە دەست پێ بکات، دەبوایە لە حکوومەتێکی پێشڕەو دەستی پێکردبوایە و ناچاربوو بۆ گەییشتن بە کۆمەڵگایەکی بێ چین و خاوەنی توانستی بەرهەم هێنانێکی بەرز هەوڵ بداو لە هەمانکاتدا مەوداو کەلەبەری نێوان حکوومەتی پێشڕەو و دیموکراسیی پڕۆلتاری، کە مارکس وەکو یەکەم قۆناغی دوای شۆڕش پێشبینی کردبوو، پڕبکاتەوە.

لێرەدا با ئەم هەموو گۆڕانکارییە تیۆری و پراکتیکییەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە توێی ئاڵووگۆڕە جیهانییەکاندا بخەینە بەر لێکۆڵینەوە. ئێستا وێ دەچێ ئەوان لەڕووی ماددییەوە بەسەر هێڵی گەییشتن بە کۆمەڵگای بێ چینایەتیدا بڕۆن. ڕوانگەی زاڵ لە رۆژئاوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئەوەبوو کە رێبەران (سۆڤیەت) مەبەستی سەرەکی خۆیان فەرامۆش کردووە. هەنووکە ئەم ڕوانگەیە لە حاڵی گۆڕاندایە، چونکە ئێستا روون بۆتەوە کە تەنانەت



ئەگەر هیچ شتێك بێجگە لە پاراستنی بەردەوامی مانەوەی سیستەمی سۆڤیەت و دەسەڵاتداریی رێبەرانی لە بەرامبەر هەڕەشە و مەترسی دانەبێ، ئەوان ناچار دەبن بەرەو ئامانجە ناوبراوەکان بڕۆن. چونکە بەسەرهەڵدانی دۆخێکی نوێی تەکنولۆژیای سەربازی، تەنیا رێگایەك بۆ سۆڤیەت بەدی دەکرێ بۆ ئەوەی هیوای بە مانەوەی دەسەڵاتی خۆی هەبێت، ئەویش پەڕەپێدانە بە جێکردنەوەی لە سەرانسەری جیهاندا. نەك ئەوەی پشت بە چەك و چۆڵی پێشکەوتوو و هێزی سەربازی ببەستێ. هەروەها جێکردنەوەی سۆڤیەت لەنێو چینی کرێکاری وڵاتە پێشکەوتووەکان و وڵاتانی تازە گەشەسەندووی ئافریقا و ئاسیادا بەستراوەتەوە بەوە تا چەند ئەو سیستەمە ئایدیای خۆی بەرجەستە کردووە واتە کۆمەڵگایەکی بێ چینی دروست کردووە. ئەم راستیانە کە رۆژ لەگەڵ رۆژ بۆ رۆژئاوا زیاتر هەست پێدەکرێن و بە قۆناغی چاو پیاخشاندنەوە گەیشتوون. چاو خشاندنەوە بەم روانگە تا چەندین ساڵ لەمەو پێش سەرنج راکێشەو لایەنگری زۆری هەیە. سیستەمی سۆڤیەت تەنیا جۆرە ستەمکارییەکی رەهایە، کە رێبەرانی حیزبێکی دەستەبژێر بەڕێوەی دەبەن. بەڵام ئەو پرسیارەی دەبێ بیکەین ئەوەیە؛ ئایا دەتوانین بە دروستی و بە تەواوی حکوومەتی پێشڕەو بڵێین دیموکراتیك، تەنانەت ئەگەر بە مانای کلاسیك و نالیبرالیش بێ؟ ناتوانرێ هیچ وەڵامێکی سادە و سانا بۆ ئەم پرسیارە بدرێتەوە. لە کردەوەدا وەڵام دانەوە بەم پرسیارە پەیوەستی بەوەیە کە ئێمە دیموکراسی تەنیا بە سیستەمی حکوومی بزانین یان وەك جۆرێك لە کۆمەڵگاکان لێکی بدەینەوە؟

ئەگەر دیموکراسی چ لە مانای تایبەت و چ لە مانای بەربڵاوی خۆیدا، بە سیستەمی حکوومی بزانین، دەبێ وەکو سیستەمێك چاوی لێ بکەین، کە تێیدا زۆربەی جەماوەر و چاودێری دەسەڵاتدارانی حکوومەت و هەروەها کەسانێك کە دوایین راو بۆچوونی سیاسی دەردەبڕن. هەڵبەت زۆرینە بێجگە لە چەند بابەتێك وەکو دانیشتنی ئەنجوومەنی شارو بەم چەشنە کۆبوونەوە بچووکانە، ناتوانن بۆ هەمیشە حکوومەت بکەن.

تەنانەت ئەم فۆرمول-ەش تەواو روون و ئاشکرا نییە و لێڵ و شاراوەیە. چاودێری کردنی راستەقینە دەبێ تا چ رادەیەك بێ؟ چاودێریی دەبێ لە کوێی ئەم پۆلین کردنە بەرینەدا بێ؟ ئایا هەموو بەرپرسێکی رەسمی، لەسەرترینەوە بۆ نزمترین پلە، دەبێ راستەوخۆ هەڵبژێردرێ و بەشێوەی ساڵانە یان رۆژانە وەڵامدەر بێ؟ ئایا ئەوان تەنیا دەبێ نوێنەری هەرێمەکانی خۆیان بن و هیچ چەشنە ئیختیارێکیان لە راوبۆچوونی راستەوخۆدا نەبێ؟ ئەم چەشنە چاودێری کردنە، چاودێرییەکی راستەقینەیە. بەڵام وەها چاودێرییەك بەهیچ شێوە جێگای ئەرك و کارە حکوومییەکان ناگرێتەوە.

یان لە لایەنێکی ترەوە، ئایا ئەوە بەسە کە تەواوی دەسەڵات لە رێبەرێکەوە سەرچاوە بگرێ کە بۆخۆی دەسەڵاتی لە هەڵبژاردنی دەورەیی وەچنگ هێناوەو ئەویش تەنیا بەم پرسیارە کە ئایا پشتیوانی رێبەری خۆتانن؟ ئێمە هەموو دەڵێین کە ئەم چەشنە چاودێری کردنە تەواو و بەس نییە.

چاودێری و بەشداریی راستەقینەی زۆربەی جەماوەر، دەکەوێتە شوێنێك لەنێوان ئەم دوو جۆرەدا. ئەگەر سەروەری زۆرینە بەراستی مانای هەیە، لانی کەم ئەم زۆرینەیە دەبێ بتوانێ ویستی خۆی بێنێتە ئاراوەو جێبەجێی بکات.

بەڵام ئەم بابەتە ئێمە تووشی گرفتێکی بنەڕەتی دەکا، کە لە گشت قۆناغەکانی شۆڕشدا حاشا هەڵنەگرە. ئەوشتەی دۆخی مێژوویی دەکاتە دۆخی شۆڕشگێڕانە و پڕ گۆڕانکاری، هەبوونی باوەڕێکی گشتییە لەسەر ئەم بنەمایە، کە سیستەمی ئێستا یان پێوەندی دەسەڵاتی نێوان جەماوەرو حکوومەت، تارادەیەك زیان بە مرۆڤایەتی ئەوان دەگەیەنێت. ئەم باوەڕەی هەر بەو رادەیەی کە لە شۆڕشە گەورەکانی لیبراڵیدا وەکو؛ شۆڕشی سەدەی حەڤدەی بەریتانیا و شۆڕشی سەدەی هەژدەی فەڕانسە، کاریگەی هەبوو، متمانەی پێ دەکرا، لە شۆڕشە نالیبراڵییەکانی سەدەی بیستەم-یشدا هەر بەم شێوەیە. ئەگەر ئێوە وەکو بەدی



هێنەرانی ئەم شۆڕشانە پێتان وایە، کە پێکهاتەی کۆمەڵگا و ئەو دەسەڵاتەی بەسەریدا زاڵە، سووکایەتیی کردووە بە مرۆڤایەتیی خەڵك و ئەوانیشی کۆیلە کردووە، پێشی بە ناسینی حەقیقەتی مرۆڤایەتیی ئەوان گرتووە، ئێوە چی دەکەن؟ چۆن کۆمەڵگایەکی سووکایەتی پێکراو دەگۆڕدرێ، ئەویش بەدەستی کەسانێك کە خۆیان سووکایەتییان پێکردووە؟ ئەمە گرفتێك بووە کە نە تەنیا لیبرال و رادیکاڵەکان، بەڵکو کۆنەپارێز و ریفۆرم خوازان، لە ئەفلاتوونەوە هەتا رۆسۆ، لە سێرتووماس-ەوە هەتا مارکس، تووشی هاتوون. بەم پێناسەیە میللەتی سووکایەتی پێ کراو ئەو نەتەوەیەیە کە بەشێوەی کۆ ناتوانێ چاکسازی لەخۆیدا بکا، ناتوانین چاوەڕوانیمان لێی بێ کە لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ.

لەو وەڵامانەی کە لەلایەن گەورەترین رێفۆرم خوازە سیاسییەکان، لە کۆنە پارێزترینەوە هەتا رادیکاڵترین بۆ ئەم پرسیارە دراوەتەوە، تەنیا لەسەر رێبەرییەکی رووناکبیرانە یان ئەخلاقی، هەمیشە یان کەمتر پێداگری کراوە، ئەفلاتوون وردبین ترین بیرمەندی جیهانی دێرین، لایەنگری لە حکوومەتێکی بەدەسەڵات و خاوەن شکۆ دەکرد کە لە دەستەی بژاردە و رووناکبیران دابوو. رۆسۆ پشتیوانی لە رێبەرانێك کرد کە کاریزماتیك یان زانان و هەوڵ دەدەن بۆ گۆڕانی کۆمەڵگا لە رووی ئەخلاقییەوە. ئەم دەستەیە لە رێبەران بەهۆی کەسایەتیی تایبەتی و رۆحانیی خۆیان، سەرنج راکێشییەکی گشتی و سەیرو سەمەرەیان لەنێو خەڵکدا هەیە و دەتوانن بە کەڵك وەرگرتن لەم نفوزە، کۆمەڵگایەکی ئازاد و دیموکراتیك و بەرابەرییێك بەدی بێنن، لینین لەسەر بنەمای بۆچوونەکانی مارکس، بەمە گەییشت کە دەسەڵات دەبێ بگوازرێتەوە بۆ چینی پێشکەوتوو و پێشڕەو، تەنیا ئەم چینە دەتوانێ بە تەواوی هێزەوە و بەشێوەیەك هەڵسووکەوتە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگا بگۆڕێ کە ئەندامانی کۆمەڵگا، لە هەست بە سووکایەتی و بێ بایەخی رزگاریان بێت، تا ئەو جێیەی گەشە بە توانا مرۆڤایەتییەکانی خۆیان بدەن کە ئیتر نیازێك بە دەوڵەت یان حکوومەتی زۆرە ملی نەبێ، هەرکام لەم رێگایانە پڕ مەترسین. لەراستیدا هیچ شتێ ناتوانێ زەمانەتی

ئەوەبکا کە حکوومەتی دەستەبژێرەکانی ئەفلاتوون یان ڕێبەرە زاناکان، (کاریزماتیك) ڕۆسۆ و پێشڕەوانی لێنین دەسەڵات لە خزمەت ئەو ئامانجانە دابنێین کە دەست نیشان کراون. بەم حاڵە لە هەلومەرجێکدا کە ئێمە باسی لێدەکەین هیچ ڕێیەکی کەم مەترسیدارتر بەدی ناکرێ، ئەم بۆچوونە کە لە بنیاتنانەوەی تاك لە ئاستی فراوان و لە ناخی کۆمەڵگای کۆندا دەتوانێ گۆڕانکاریی باشی بەدواوە بێ، لە کردەوەدا هەمیشە تووشی شکست بووە. نەتەوەیەك کە لەنێو کۆمەڵگادا و لە ڕوانگەی ئەخلاقییەوە سووکایەتی پێ کراوە و بەرەو داڕووخان چووە، لە دیدی ئەخلاقییەوە ناکرێ بنیات بنرێتەوە، مەگەر ئەوەی کۆمەڵگا ڕۆحی وەبەربنرێ و تازە بکرێتەوە ئەم کارەش پێویستی بە دەسەڵاتی سیاسی هەیە.

بەم پێیە لە قۆناغێکی شۆڕشگێڕیدا، کاتێ بەشێ لە کۆمەڵگا هەست بەم سووکایەتییە دەکەن و بەدروستی چۆنیەتی ڕەوتەکە نازانن، یان کاتێ کۆمەڵگا وەها سوکایەتی پێ کراوە کە تەنیا لە بەشێکی بچووکی جەماوەر چاوەڕوان دەکرێ کە ئاگاداری ئەم خاڵە بن، پشت بەستن بە دەنگی ئازادی گشت جەماوەر بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی مرۆڤی بێ قازانجە. ئەگەر وەها کۆمەڵگایەك بەدەستی چینێکی پێشڕەو پێك نەیەت لە داهاتووشدا هەرگیز دروست نابێت.

ئێمە لە ڕۆژئاوادا بەختێکی سەیر و سەمەرەمان هەیە کە ئێستا لانی کەم تووشی گرفتێکی ئاوا توندو تیژانە نەیەین. ئێمە توانیومانە بە شەپۆڵی شۆڕشە لیبرالییەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدە کە ئەوانیش بەهۆی چینی پێشڕەوەوە سەریان هەڵدا، بگەینە بەستێنی دەریا.

ئێستا دیسان دەگەڕێینەوە سەر ئەو پرسیارەی کە لێمان کراوە؛ ئایا دەتوانین بە دەوڵەتێکی پێشڕەو بڵێین دیموکراتیك؟ ئەگەر دیموکراسی لە دروستترین ماناکەیدا-واتە سیستەمێك کە تێیدا حکوومەتەکان هەڵدەبژێردرێن- بەکاربێنین، ئەوکات دەوڵەتێکی پێشڕەو ئیتر نابێتە دیموکراتیك. وەها دەوڵەتێك بۆ خەڵك حکوومەت دەکا بەڵام نەك بەدەستی خەڵك و تەنانەت



نەك بەپێی هەڵبژاردنی خەڵك. دەوڵەتێکی پێشڕەو ناتوانێ بەشێوەیەکی بنەڕەتی، دەوڵەتێکی دیموکراتیك بێ. چونکە هۆی هەبوونی حکوومەتی پێشڕەو، نزمی و دواکەوتوویی جەماوەرەو هەروەها پڕ بوونی ئەو خەڵکەیە لە ئەخلاق و بایەخەکانی کۆمەڵگای نامرۆڤایەتی، لێرەدا حکوومەت دەبێ ڕاستەوخۆ ئەو کۆمەڵگایە ژێرو ژووربکا.

بەڵاًم حکوومەتێکی پێشڕەو دەتوانێ وردە وردە ببێتە حکوومەتێکی دیموکراتیك. واتە ویستەکان، ئامانجەکان و سیستەمی بایەخی گشت جەماوەر بەهۆی گۆڕانی دامەزراوەکان کاتێ ئاڵووگۆڕ بەخۆیەوە دەبینێ کە خەڵك ئازادانە پشتیوانی لەو چەشنە کۆمەڵگایە بکەن، کە دەوڵەتی پێشڕەو بەدیاری هێناویەتی. هەتا حکوومەت و دەوڵەتی پاش شۆڕش حکوومەتێکی چینایەتییە، گواستنەوەی دەوڵەتی پێشڕەو بەرەو دەوڵەتی سەرلەبەر دیموکراتیك بە دژواری ئەنجام دەدرێ. دەبێ دان بەوە دابنێین کە لێنین لە مارکس زیرەکتر بوو بەڵام ئەو گۆڕانەی من ئاماژەم پێ کرد لەو ڕوانگەیەوە ئەنجام دەدرێ کە سیستەمی چینایەتی چەوسێنەرانەی کۆن لەناوچووەو هیچ چینێکی چەوسێنەری نوێ ئیزنی نییە کە شوێن و جێگاکەی داگیربکا.

ئەم گۆڕانە پێویستی بەوەنییە کە سیستەمێکی پێکهاتوو لە حیزبە ڕکەبەرەکان دروست بێ. بەڵام ئەگەر تەنیا حیزبێك دەست لە کاروباری سیاسی وەردەدا، دەبێ لە ناخی خۆیدا کەرەسەی کاریگەری هەبێ تا بتوانێ لە ژێرەوە بۆ سەرەوە چاودێری کردن مسۆگەر بکا. بەواتایەکی تر دەبێ دیموکراسییەکی ناوحیزبی لە ئارادا بێ. تەواوی حیزبە کۆمۆنیستە دەسەڵاتدارەکان بانگەشەی وەها دیموکراسییەك دەکەن، بەڵام ئێمە لە ڕۆژئاوادا پێمانوانییە هیچ کام لەوان بەم ڕاستیە گەییشتبن. هەڵبەت بیرمەندان و چاودێران لە ڕۆژئاوادا سەرنجێك بەرەو ئەم لایە دەبینن، هەرچەند بەڵگەکان وا نائاشکران کە بەدڵنیاییەوە ناگوترێ کە ئەم سەرنجە بەرەو کوێ دەڕوا. بەڵام وا باشە سەرنج بدەین کە لە ڕاستیدا ئەم ڕێ هەڵبژاردنە دەتوانێ بەبێ هیچ گۆڕانێکی هەست پێ کراو لە سیستەمی سیاسیدا درێژەی هەبێ.



PDF 4 KURD

سەرەڕای هەموو ئەمانە ئێستاش دەتوانرێ بگوترێ کە دەوڵەتی تاك حیزبی هەرچەند خاوەنی کاملترین چەشنی دیموکراسیی ناو حیزبی بێ، ناتوانێ ببێتە دیموکراتیك. چونکە دەوڵەتی تاك حیزبی بەبێ وەبەرچاو گرتنی دیموکراسیی ناو حیزبی و ئازادیی ئەندامێتی لە حیزبەکاندا تەنیا مافی دەنگ بۆ کەسێك رەوا دەبینێ کە بەڕادەی پێویست و لە روانگەی سیاسییەوە بۆ ئەندام بوون لە حیزبدا هەوڵ دەدا. لە تەواوی حکوومەتە کۆمۆنیستییەکاندا هەتا ئێستا چالاکی و هەڵسوڕانی سیاسی مەرجی ئەندام بوون لە حیزبدا بووەو زۆرینەی خەڵکی ئەم وڵاتانە ناتوانن ئا بەم جۆرە بن.

زۆربەی ئێمەدەڵێین، کە ئەم رادەیە لە چالاکی و هەڵسوران بۆ وەچنگ هێنانی مافی دەنگدان و ئەم راستییە کە سیستەمێکی سیاسی مەرجی ئاوا دژوار دەست نیشان بکا، دەبێتە هۆی ئەوەی پێی نەڵێین دیموکراتیك. بەم حاڵە چ کەسێك لە ئێمە دەڵێ کە بۆ وەچنگ هێنانی ئەم ئامانجە نابێ هیچ نرخێك بدەین؟ ئەگەر رێگە بدەین کە کەمترین جوڵانەوەو هەڵسوڕان مەرجی پێویست بێ بۆ وەچنگ هێنانی مافی دەنگدان، ئەو کات سیستەمێکی تاك حیزبی کە بۆ گەییشتن بە ئامانج، نیازی بە چالاکی و هەڵسوڕانێکی ئەوتۆ نییە، دەتوانێ ببێتە دیموکراتیك، بۆ گەییشتن بەم شوێن و پلەیە ئەندام بوون لە حیزبدا دەبێ بە تەواوی ئازاد بێ، ئەگینا پێش بە شتێك لە دەنگە راستەقینەکان دەگیرێ.

بەم پێیە پێدەچێ کە دەوڵەتی تاك حیزبی-ش لە بنەڕەتدا دەتوانێ ببێتە دیموکراتیك. تەنانەت لە چەمکی راستەقینەی وشەدا بەو مەرجەی:

١- دیموکراسییەکی تەواو لەناو حیزبدا هەبێ.

٢- ئەندام بوون لە حیزبدا ئازاد بێ و .........

٣- مەرجی بەشداری و چالاکی و هەڵسوڕان لە حیزبدا، لە رادەی توانا و چاوەڕوانی خەڵکی مام ناوەندیدا بێ.



تا ئەو کاتەی کۆمەڵگا لە سەر بناغەی چینەکان دارێژرابێ، دوو مەرجی ناوبراو کە لەسەرەتاوە ئاماژەیان بۆ کرا، بەرێوە ناچن و مەرجی سێهەم-یش بۆ بە ئاکام گەییشتن نیازی بە تێپەڕینی زەمانێکی زیاتر هەیە.

وێناچێ کە ئەم سێ مەرجە تا ئێستا لە هیچ کام لە وڵاتە کۆمۆنیستیەکان بە ئاکام گەیشتبن، هەرچەند دەبێ دان بەوە دابنێین کە ئێمە ناتوانین مەرج و پێوانەگەلێك بۆ هەڵسەنگاندنی راستی و دروستی چەندایەتی و چۆنیەتی ئەم چەشنە حکوومەتانە دەست نیشان بکەین.

ئێمە بەم پرسیارەوە دەست پێدەکەین کە ئایا حکوومەتی پێشڕەو بەپێی وێنەی لێنین-یستی دەتوانێ ببێتە دیموکراتیك؟ وەڵامی من (نا) بوو، من ئەو مەرجانەم شی کردەوە کە حکوومەتێکی پێشرەوی تاك حیزبی دەکاتە دیموکراتیك، هەروەها گوتم کە ئەم مەرجانە هێشتا بەکردەوە خۆیان نیشان نەداوە.

بەڵام دەبێ لە بیرمان بێ کە ئەم مەرجانە تەنیا کاتێ پێویستە بێن کە مانای راستەقینەی دیموکراسی مان لەبەرچاو بێ. هەروەها دەبێ سەرنج بدەین کە بێجگە لە چەمکی ناوبراو، مانایەکی مێژوویی لە دیموکراسیدا هەیە، کە ئەویش باوەڕپێکراو و یاساییە. بەگشتی دیموکراسی بە مانایەکی بەرینتر لە سیستەمێکی حکوومەتی دەگوترێ. لەم مانایەدا دیموکراسی هەڵگری ئەم بۆچوونانەی وەکو یەکسانیی مرۆڤەکانە و ئەم یەکسانییە بە دەرفەتی وەك یەك بۆچوونە سەر لە پلەداریی چینایەتی، دیاری ناکرێ، بەڵکو ئاماژە بە چەمکێکی گشتی تر دەکا، بەواتایەکی تر بەرابەری روو دەکاتە ئەو ئاستەی کە هیچ چینێکی کۆمەڵایەتی نەتوانێ چینەکانی تر بچەوسێنێتەوە، خۆی یان بەهۆی ئەوانەوە درێژە بە ژیان بدا.

ئەگەر دیموکراسی لەم چەمکە گشتگیرەدا وەبەرچاو بگرین، ئەو کات بانگەشەی حکوومەتە پێشڕەوەکان لایەنێکی تر بەخۆیەوە دەگرێ. لە هەر شوێنێکدا هەلومەرج بەو شێوەیە بێ کە

ڕۆیشتن بەرەو وەها کۆمەڵگایەك، بێجگە لە ڕێگای زاڵ بوونی چینێکی پێشڕەو دەستەبەر نەکرێ، ئەو کات هەتا ئەم چینە بە ئامانجەکانی خۆی وەفاداربێ، دەتوانین بەم حکوومەتە بڵێین دیموکراتیك.

بەگشتی حکوومەتە کۆمۆنیستەکان بانگەشەی دیموکراسی دەکەن. ئەم بانگەشەیە هەم بە مانای سەرەکی و هەم بەمانا دیاریکراوەکەیەتی. بە بۆچوونی من ئەمە هەڵەیە. ئەگەر ئەم حکوومەتانە بۆچوونی ڕۆژئاوایان بە دروستی و بەپێی دیموکراسیی گشتگیر و گشتی هەڵدەسەنگاند، باشتر کاریان دەکرد. بەم پێیە حکوومەتە کۆمۆنیستەکان کاتێ بە قۆناغی ڕاستەقینەی دیموکراسیی دەگەییشتن، دەیانتوانی بانگەشەی حکوومەتێکی دیموکراتیك بکەن و دەوڵەتانی تریش لەم ڕوانگەیەوە قبووڵیان دەکردن. بەڵام کاتێ حکوومەتە کۆمۆنیستەکان دەستیان بەکارکرد لارییان لە بۆچوونە گونجاو و پۆزەتیڤەکانی ڕۆژئاوا نەکردەوە، چونکە ئەوەی ڕۆژئاوا گەڵاڵەی بۆ داڕشتبوو ئەوان نەیاندەتوانی خۆیانی لەگەڵ ڕێك بخەن.

ئێستا چەند هۆیەکی پتەو و نوێ هاتووەنەتە ئاراوەو پێکەوە ژیانی هێدی و ئارامی کردۆتە پێداویستیەك، ڕوانگەی ئەوان بۆ ڕۆژئاوا ئاڵوگۆڕیی بەسەر داهاتووەو سەرنج دەدەنە بۆچوونە باشەکانی ڕۆژئاوا. هەنووکە ئەوان بەو شوێنەوارە زیانهێنەرەیان زانییەوە، کە بەهۆی پێداگریی یەك لایەنە لەسەر دیموکراسی کۆمۆنیستی دروست بووە. ئەم کاریگەرییە زیانهێنەرانە تەنیا لە کاتێکدا ساغ دەکرێتەوە، کە دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکان دەست لە بانگەشەی دیموکراسی تایبەت بەخۆیان هەڵگرن و نموونەی گشتگیری (دیموکراسی) قبووڵ بکەن. خۆشبەختانە هەلومەرجی نوێی نێونەتەوەیی، واتە پێکەوە ژیان، جووڵانەوەی ئەوانی لەنێو ئەم ئاراستەیەدا ئاسان کردووە.



## **دیموکراسیی نالیبرالی**: **ناوچە گەشە نەکردووەکان**

قۆناغی هاوچەرخ شاهیدی سەرهەڵدانی باردۆخێکی نوێیە لە چەند شوێنی جیهاندا کەپێی دەگوترێ: ((جیهانی سێهەم)). ئەم ناوچانە واتە ئاسیا و ئافریقا، لە کولتووری سیاسیی ئێستادا بەو ناوچانە دەگوترێ کە تازە سەربەخۆییان بەدەستهێناوە، یان لە حاڵی گەشەسەندندان. ئەو وڵاتانەی نێومان هێنان، لە هیچ کات لە دوو بەرەی کۆمۆنیزم و سەرمایەداری دانین، گشت شوێنەکانی ئەم دوو کیشوەرە (ئاسیا و ئافریقا) هەر بەم شێوەیەن، هەڵبەت ئەمە بێجگە لە چین، کۆریای باکوور و ڤێتنام-ە. لەم دە بیست ساڵەی دواتردا نەتەوەکانی جیهانی سێهەم لە چنگی دەوڵەتە داگیرکەرەکان ڕزگار بوون و لەڕێگای شۆڕش یان بە هێمنی و هێور هێور بەسەربەخۆیی گەیشتوون. لەم دوو حاڵەدا ئاڵوگۆڕیی وەها گەورەو بەرچاوە، کە دەتوانین نێوی شۆڕشی لەسەر دانێین. ئەم شۆڕشانە زۆرجاران لەڕێی بزووتنەوەی ڕێکخراوەیی خەڵکی و ڕێبەریی کەسانێك ئەنجام دەدرێ، کە بەهۆی ڕوانگەی خۆیان بۆ داهاتوو توانیویانە لەنێو جەماوەردا شوێن و پلەیەکی تۆکمەیان هەبێ و بەشێك لەم ڕوانگەیە (نەك هەمووی) وێنەیەکی دیموکراسییە.

مانای ئەم چەشنە دیموکراسییە چییە؟ ئەوە ڕاستە کە مانای ئەم جۆرە دیموکراسییە لەگەڵ ئەوە جیاوازە کە تا بە هەنووکە لەسەری دواوین. ئەم دیموکراسییە نە لە چەشنی ڕۆژئاوایی واتە دیموکراسیی لیبراڵ دەچێ نە لەو دیموکراسییەی کە مەبەستی مارکس و لینین-ە، بەڵکو لەم دوو چەشنەی کە ناومان هێنان نوێترە. بەڵام لە لایەکەوە لەم دوو چەشنەش کۆنترە، چونکە لە ڕواڵەتدا هەر ئەو چەمکەی لەبەرچاوە کە پێشتریش و پێش سەرهەڵدانی دیموکراسیی چەشنی ڕۆژئاوایی و کۆمۆنیستی لە ئارادابووە. دیموکراسی سەردەمانی کۆن یان حکوومەتی خەڵك و بە قازانجی خەڵك لەو سەرەوە کە نەتەوەکانی لە حاڵی گەشەدا، بەگشتی و بەراورد لەگەڵ ئەو نەتەوانەی بەسەریاندا زاڵن، کولتووری سادەتریان بووە،

سرووشتییە کە لەو چەمکەی دیموکراسی حاڵی بوون، کە لە کۆمەڵگای پێش پیشەسازیدا سەری هەڵداوە.

لە وتاری یەکەمدا، باسمان کرد کە لە ڕۆژئاوا چۆن ئەم تێگەیشتنە لە دیموکراسیدا، گۆڕانی بەخۆیەوە بینی و لە چاخی سەرهەڵدانی دەوڵەتی لیبرالدا بوو بە دیموکراسی لیبرال و ئاڵووگۆڕی بەسەرداهات. لە وتاری دووەمدا، چۆنیەتی خۆگرتنی چەمکی دیموکراسی — کۆمۆنیستیمان خستەبەر لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو گوتمان کە مارکس و لێنین مانایەکی چینایەتی-یان بە دیموکراسی بەخشی و پێیان وابوو کە لە دوو قۆناغی پێشڕەو و پێشکەوتوودا، دیموکراسیی چینایەتی سەرجەمی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەخۆدەگرێ.

بەڵام تێگەیشتنی نەتەوەکانی جیهانی سێهەم بۆ دیموکراسی، لەچاو دووچەشنی کۆمۆنیستی و ڕۆژئاوایی (لیبرال)، لە دیموکراسی، چەشنی کۆن نزیکترە. ئەمەش بەهۆی هەستی رزگاریخوازیی لە چنگ داگیرکەران و وەچنگ هێنانی سەربەخۆیی و ئازادییە. دیموکراسیی جیهانی سێهەم هیچ کام لە تایبەتمەندییە تاك خوازییە لیبرالییەکانی ڕۆژئاوایی قبووڵ نەکردووە. هەروەها نیشانەیەکیش لە دیموکراسیی چینایەیتی مارکس-ی تێدا نابیندرێ.

بۆ ئەوەی باشتر بتوانین دیموکراسی چەشنی جیهانی سێهەم بناسین، پێویستە لایەنگەلێك بناسین کە ئەم میللەتانە لە دوو چەشنی دیموکراسی ناوبراویان وەرگرتووە، یان لە خۆیان دوور خستۆتەوە. لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بنچینەی دیموکراسی بەم شێوەیە دامەزراوە؛ زۆربەی ڕێبەرە سیاسییەکانی ئەوان لە ڕۆژئاوا لانی کەم لەسەر بنەمای نەریتە ئورووپاییەکان خوێندوویانە، ئەوان لەگەڵ هەردوو تیۆری مارکسیستی و لیبراڵی ئاشنان و تیۆری تایبەتی خۆیان بە کەڵك ڕەهەندە مێژوویيەکانی رابوردوو و ئێستای بارودۆخی تایبەتی نەتەوەی خۆیان بەراورد بکرێ. بۆیە پێویستە لەنێو تیۆرەکانیاندا نە تەنیا لایەنی قبوڵ کراو یان ڕەت کراو هەڵبژێرین، بەڵکو دەبێ هۆکاری ئەم کارە بەدروستی دەستنیشان بکەین بەم شێوەیە لە بەردەوامی و خۆڕاگری تیۆری دیموکراسی نێو جیهانی سێهەمی تێدەگەین.



پێش هەموو شتێ دەبێ بڵێین کە وڵاتە تازەگەشەسەندووەکان بەگشتی دیموکراسیی لیبرالی ڕۆژئاوایان ڕەت کردۆتەوە. بەم پێیە دیموکراسی جێگەی مەبەستی ئەوان لە چەشنی تاکخوازی لیبرال نییەو ئەگەر وابوایە سەیر دەبوو. کۆمەڵگای دارێژراو لەسەر پێوەندی رکەبەرایەتی ئاسایی بازاڕ، کە شوێنی سەرهەڵدان و گەشەی دەوڵەتی لیبرالی ڕۆژئاوایە، لای نەتەوەکانی جیهانی سێهەم نامۆیە. بە بۆچوونی ئەوان وەها کۆمەڵگایەك لە دەرەوەو لەسەرەوە بەسەر ئەوان داسەپاوە. پێکهاتەی سوونەتی ئەو کۆمەڵگایانە و کولتووری زاڵ بەسەر ئەواندا کە کلتوورێکی تەقلیدییە، بەگشتی لەگەڵ رکەبەرایەتی نا ئاشنایە ئەوان لە دارایی کۆکردنەوە، بایەخێکی زاتی —یان نەدەدی و قازانجی تاکە کەسیان بەشتێکی بێ متمانە و نادروست دەزانی. بەرابەری و یەکێتی و هەروەها بەرابەری لە ناخی کۆدا، لەچاو ئازادی تاك بایەخی زیاتری هەیە.

بەم شێوەیەش رکەبەرایەتی سیاسی وەکو رکەبەرایەتی ئابووری ڕەت دەکەنەوەو بەم هۆیە لەم چەشنە کۆمەڵگایانەدا بناغەی سیستەمی حیزبە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان زۆر لاوازن. لە بەشێك لەم وڵاتانەی کە لە حاڵی گەشەدان، هێشتاش بە چینایەتی کردنی کۆمەڵگا لە چەشنی خێڵەکی و ئایینییە کە لەسەر یەکگرتوویی نەتەوە پێدادەگرێ و بانگەوازی بۆ دەکا. ئەم چەشنە دابەش کردنە جاری وابووە بۆتە هۆی پێکهاتنی حیزبە سیاسییە نەیارەکان-یش. بەڵام لەنێو ئەم وڵاتانەدا باوەڕ بە سیستەمێکی پێکهاتوو لە حیزبە نەتەوەییەکان وەکو سیستەمێکی گرێکەرەوەی حکوومەتی بەدەسەڵات و کارلێهاتوو، بەروانگەیەکی نامۆ و بیانی دادەنرێ.

لە نێوان ساڵەکانی بزووتنەوەی سەربەخۆیی خوازانەدا، هیچ هەلێکی باش و هاندەر بۆ پەرەپێدانی لیبرالیزم نەدەڕەخسا. بەم حاڵە نەبوونی بنەمایەك بۆ پێگەیشتنی کۆمەڵگای بازاڕی یان دەوڵەتی لیبراڵی-یش بەرچاو بوو. ئەم کەش و هەوایە کە لەم وڵاتانەدا دیاربوو

هیچ یارمەتییەکی سەرهەڵدانی لیبراڵیزم-یان نەداوە. بەپێچەوانەوە، پێویست بوونی خەبات بۆ سەربەخۆیی، بەگشتی بنەمای سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی جەماوەری یان حیزبێکی دەسەڵاتدار و ڕێبەری دەستەبەرکردووە. ئەم پێش بنەمایە بوو بەهۆی ئەوەی لەنێو دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان لە ڕووی پێکهاتەی سیاسی — کە تاک حیزبی یان لانی کەم خاوەنی حیزبێکی زاڵ-ن، حیزبی یان دەستەیەك بەزۆرینەی یاسایی و مەشروع بکات و لەڕێی دەسەڵاتی یاسایی، سیاسی و پۆلیسیانەی خۆیەوە، حیزبە ڕکەبەرەکان سنوور بەندی بکات. هەڵبەت باڵا دەستی حیزبێك یان جووڵانەوەیەکی سیاسی، بەرهەمی سروشتی هەر شۆڕشێکە. ڕەنگە ئەم باڵا دەستییەش لەوە دابێ کە ئیرادەی کۆی زۆرینەی بەشداربووان لە شۆڕشدا، بەڕێبەرایەتی حیزبێك بۆ بەرەنگاری کردن لە بەرانبەر دەسەڵاتی بێگانە لەکار بکرێ و بە ئاکام بگا. لەو شوێنانەی کە هێشتا جیاکردنەوەی چینایەتی لەنێو نەتەوەی ناوبراودا ڕووی نەدابێ و لە کۆتاییدا کاتێ ئامانجی ڕاپەڕینی جەماوەری، تەنیا بۆ سەربەخۆیی نەبێ و مەبەست گەلێك وەکو مۆدێرنیزە کردنی کۆمەڵگا و هەروەها باشترکردنی بەرهەم هێنانی ماددی لە ئارادابێ، ڕەنگە ڕێبەرایەتی سیستەمی تاك حیزبی دیسان زیاتر لە پێش بێ.

گومان لەوەدانییە کە ئەو نەتەوانەی تازە بەسەربەخۆیی گەیشتوون و لەحاڵی گەشەسەندن دان، ناچارن مۆدێرنیزە بن و پەرە بە بەرهەمهێنان بدەن، تا بتوانن سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن و پێداویستی بۆ ژیانێکی خۆش و شیاوی مرۆڤایەتی دەستەبەر بکەن. ئەم ئەرکە لە وڵاتانی لە حاڵی گەشەدا بە ئامانجێکی مەزن دادەنرێ، کە پێویستی بە ڕێبەرییەکی بەهێزی سیاسی هەیە. هەڵبەت ڕەنگە ویستی گشتی سەربەخۆیی و تەنانەت نۆکردنەوە بێ، کە زۆرجاریش هەروابوو، بەڵام تەنانەت بەهێزترین و پێداگرترین ویستە گشتیەکان کە لەم ڕێبازەدان، دەبێ ڕۆحی تازەتریان وەبەربنرێ. هەرچەند بێگومان وەها کارێك لەتوانای سیستەمێکی حیزبی ڕکەبەرایەتیدایە. بەم حاڵە دەتوانێ بەدەستی حیزبێ بە ئاکام بگا کە



پێشتر توانایی و لێوەشاوەیی خۆی بۆ وروژاندن و یەك دەست کردنی ویستی گشتی سەلماندووە. بەرفراوانی و قورسایی ئەم چەشنە ئەرکانە، کە لەسەرشانی حکوومەتی نوێ (حکوومەتی شۆڕشگێڕ) دانراوە، بەدوو شێوە بەرەو لایەنگری لە دەوڵەتێکی لیبرال دەڕوا، ئەگەر زۆرینەی هەڵسوڕاوی نەتەوە لە گرینگی و گەورەیی ئەو مەبەست و ئەرکانە تێبگەن، ڕەنگە لایەنگری و پشتگیری لە دەوڵەتێ بکەن کە بەرنامەڕێژی شۆڕش و سەربەخۆیی بووە و بەم شێوەیە پێویستیان بەبوونی حیزبە جۆراوجۆرەکان (ڕکەبەر) نییە.

بەڵام ئەگەر گەورەیی و گرنگی ئامانج و ئەرکەکان نەتوانن لایەنگیری گەرم و گوڕی نەتەوە بەرەو لای خۆیان ڕاکێشن، هەر لەجێی خۆیاندا دەمێننەوە. وای دانێن، نزیك بوونەوە لە نوێکردنەوە (مۆدێرنیزەکردن) گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگا لە خۆنەگرێ، یان وای دانێن هەر بەو شێوەیەی کە هەمیشە کەسانێك مەبەستە گشتییەکان قبووڵ دەکەن، بەڵام هەر ئەوان بەهۆی جیاوازی زمانی، قەومی و ئایینی، لایەنگری و پشتگیری لە حیزبێکی تاك (ڕێبەر) ناکەن و بۆخۆیان دەیانەوێ حیزب یان بزووتنەوەیەکی دژی دەسەڵات پێك بێنن. لە دۆخێکدا دژایەتی کردنی ئەم دەستەیە لە خەڵك بەشێك وەکو خیانەت دادەنرێ (خیانەت کردن بە وڵات)، چونکە نەتەوەی تازە سەربەخۆ دەبێ پێش هەموو شتێك بنچینەی بوونی خۆیان بپارێزن. وەها بارودۆخێك بەو مانایەیە کە نوێسازی (مۆدێرنیزە کردنی کۆمەڵگا) تووشی ئەو مەترسییەمان دەکا کە دیسان ژێر دەست و لەژێر دەسەڵاتی هێزی دەرەکی دابمێنینەوە. بۆ ئەم چەشنە کۆمەڵگایانە، هەمیشە ترسی دان و ستاندنی داگیرکەری نوێ لە ئارادایە بەم پێیە دژایەتی کردن لەگەڵ حیزبی دەسەڵاتدار، ناسنامە و سەربەخۆیی نەتەوەیی ڕەت دەکاتەوەو زۆرجارانیش هەرئاوایە. لەم هەل و مەرجەدا ڕاوەستان دژی حیزبی حاکم، بەخیانەت بە نەتەوەو سەرجەم وڵات دادەنرێ و لەویش خراپتر ئەو کاتەیە بەڵگەی وا بەدەستەوە بێ کە باڵی دژ لە ژێردەستی حکوومەتی بیانی-یە. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە بە خیانەتکارانە دابنرێ. بەم پێیە لەوڵاتێکی تازە سەربەخۆی لە حاڵی گەشەدا، لەمپەرگەلێکی زاتی و ناوەکی بەدی دەکرێ، کە هاتوونەتە سەر ڕێی



PDF 4 KURD

سیستەمی دیموکراسی لیبرال. ئەم چەشنە گووشارانە نە تەنیا پێش بە خۆگرتنی سیستەمی حیزبی رکەبەر دەگرێ، بەڵکو دژ بە پاراستن و بەکارهێنانی ئازادییە راستەقینەکانی نێو کۆمەڵگا رادەوەستێ. لە وەها هەلومەرجێکدا ئازادی گەلێك وەکو ئازادی بیروڕا و چاپەمەنی کەم دەکرێتەوەو هەروەها دەستبەسەرکردن و گیران و زیندان زیاتر دەبێ. لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا ئەو گوشارانەی بەرهەڵستی حکوومەتێکی نالیبرال دەدەنەوە، خۆڕاگرتر و ریشەدارترن، نموونە هاوچەشنەکانیان لە شۆڕشە لیبرالییە کلاسیکەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدەدا بەدی دەکران (حکوومەتگەلێك کە تەنیا بۆ ماوەی یەك یان دوو دەیە توانیان بەشێوەی نالیبرال بمێننەوە)، چونکە لەم شۆڕشە مۆدێرنانەدا دوو هۆکار هەن، کە لە شۆڕشە لیبرالییەکانی سەردەمانی رابوردوو لە غیاب دابوون، یەکێك لەو هۆکارانە پێویستی بە کۆکردنەوەی سەرمایەیەکی بەرچاوە بۆ گەشەپێدانی ئابووری. لە شۆڕشە لیبراڵییە کلاسیکەکاندا سەرمایەداری و سەرمایە هۆکارانێك بوون کە پێشڕەویی هێزە جووڵاوەکانیان وەدەست دەگرت و خۆیان بۆ هەر چەشنە ئاڵوگۆڕێك ئامادە دەکرد. بەڵام لە شۆڕشە هەنووکەییەکاندا وەها شتێك روونادا. بەم پێیە دەبێ چاخێکی درێژی کەڵەکە کردنی سەرمایە و فێربوونی تەکنیکی بەرهەمهێنان تێپەڕبکات، کە ژان و گرفتی تایبەت بەخۆی هەیە هۆکاری تر بریتیە لە نیاز بەدانان و راگرتنی وەفاداریی بۆ نەتەوە، لێرەدا خێڵ یان کۆمەڵگای خۆجێیی وەبەرچاو ناگیرێ. میللەتێك کە لە قۆناغی پێش سیاسی و پێش نەتەوەیی دایە دەبێ هۆشیاری و شعووری سیاسی و نەتەوەیی بۆ خۆی دەستەبەر بکا. ئەم کارە بەڕێبەری ئایدیۆلۆژیایەکی پڕ هێز بزووتنەوەی جەماوەری وەپێش دەخا. وەها هۆکار لە هیچ کام لە شۆڕشە لیبرالییەکانی کلاسیکدا، کە تا پێش خۆگرتنی چەمکی راستەقینەی نەتەوەو هێزە دامەزراوەکان سەری هەڵنەدا، بەدی نەکرا.

لەبەر ئەم هۆیانەیە کە زاڵبوونی سیستەمی سیاسییە نالیبراڵەکان لەنێو وڵاتانی تازە سەربەخۆی لە حاڵی گەشەسەندندا بە ئاسایی دادەنرێن. بەڵام بانگەشەی ئەوان بۆ دیموکراتیك بوون چۆن هەڵدەسەنگێندرێ؟



ئەم بانگەشەیە لەسەربنەمای وێناکردنی ئیرادەی گشتی دامەزراوە، کە دەتوانێ بوونی خۆی لە چوارچێوەی حیزبێکدا نیشان بدا. ئەم شێوە هاوفکرییە لەنێو خەڵکی ئەم وڵاتانەدا هەیە و خەڵکەکەی زیاتر لەو نەتەوانەی رۆژئاوا کە رکەبەرایەتی تر، تاك خوازتر و چینایەتی ترن، یەکێتی گشتییان هەیە. ئەمە بانگەشەیەکە و تەنانەت درووستیشە؟ ئەوەی کە ئایا دەتوانین لە حیزبێکی تاکدا بە رسکانەوەی وەها ئیرادەیەك بڵێین دیموکراسی یان نا؟، دەروەستی ئەوەیە کە ئەندامانی ئاسایی حیزبێك تا چ رادەیەك دەسەڵاتداربن و رادەی ئەندام وەرگرتنی حیزبەکە چەند بێ و تا چ رادەیەك درەگا لەسەر ئەندامە نوێیەکان کرابێتەوە و نرخی ئەندامییەتی لەو حیزبەدا لەگەڵ چ رادەیەك لە چالاکی و هەڵسووڕان بەراورد بکرێ.

لە گوتاری دووهەمدا ئاماژەم بەوە کرد، کاتێ دەتوانین بە سیستەمێکی تاك حیزبی بڵێین دیموکراتیك، کە دیموکراسی ناو حیزبی لە ئارادابێ، ئەندامییەتی لە حیزبدا ئازاد بێ و بەشی هەر کەسێ لە هەڵسووڕانی حیزبی کەمتر لەو نرخە نەبێ کە دەیدا. گوتمان ئەمانە مەرج گەلێکن کە دەبێ پێش گواستنەوەی حکوومەتی شۆڕشگێڕ (پێشڕەو) بەرەو حکوومەتی دیموکراتیك، دەستەبەر بکرێن. هەروەها باسم لەوە کرد، کە تا کاتێ حکوومەتی دوای شۆڕش هێشتا حکوومەتی چینایەتییە، ئەم مەرجانە مسۆگەر ناکرێن.

بەم باسانەی کە تا بە ئێستا کراون و بەسەرنج دان بەو بارودۆخەی کە بەسەر وڵاتانی لە حاڵی گەشەدا زاڵە، بەم ئاکامە دەگەین کە لەم وڵاتانەدا خودی ئەم پێش مەرجانە لە پێش وڵاتە کۆمۆنیستییەکاندا ئامادە کراون، هەڵبەت نابێ چاوەڕوان نەکرێن، چونکە لەم وڵاتانەدا شۆڕش، خەباتێکی چینایەتی نەبووە، بەم پێیە و بەگشتی حکوومەتەکانی دوای شۆڕش-یش چینایەتی نابن.

لەراستیدا حکوومەتە نوێیەکان بەرهەمی ئەو بزووتنەوە جەماوەریانە بوون، کە بەرێبەرایەتی هێزێکی پێشڕەو پێکهاتوون، بەڵام ئەم هێزە پێشڕەو (یان رێبەر)ە بەو رادەیە کە لە

بزووتنەوە کۆمۆنیستییەکاندا لە جەماوەری خەڵك خۆی دوور خستۆتەوە، لە زۆرینەی کۆمەڵگا جیانەبۆتەوەو پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ ئەواندا هەبووە. هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئاستی چینەکان جیاواز بووە. هەر بەو شێوەیەی کە دیتمان لە شۆڕشە کۆمۆنیستییەکاندا، چینێکی بچووك لە کرێکارانی پیشەسازی توانییان لە ناوەندی دەریایەك لە چینی جوتیاراندا پلەیەکی باش وەچنگ بێنن. هەروەها بەشێکی بچووکیان هوشیاریی راستەقینەی چینایەتییان بەدەست هێنا. هێزە پێشڕەوەکان لە دوولاوە لە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی تر جیادەکرانەوە. چینی کرێکاری پیشەسازی ، بەهۆی پلەی گەشەی هەستکردنی چینایەتی هەروەها بەهۆی شوێنی سەرهەڵدانی چینایەتی لە باقی بەشەکانی کۆمەڵگا جیاواز دەکرایەوە، بەشێوەیەك کە چینی پێشڕەو لەجیاتی ئەوەی پشت بەهێزی جووتیاران ببەستێت، متمانەی بەو کرێکارانە دەکرد کە رۆژگار بوون.

لە شۆڕشە نوێیەکاندا بەگشتی بارودۆخ و هەلومەرج جیاوازە. لەم شۆڕشانەدا ئەو سیما جیاوازەی کە چینی پێشڕەو لە باقی جەماوەر جیادەکاتەوە، زیاتر شعوور و هوشیاری سیاسییە نەك جیاوازیی چینایەتی. ئەم هوشیارییە هوشیارییەکی نەتەوەیی بووە، نەك هوشیارییەکی چینایەتی. هێزی پێشڕەو لە چینی جوتیار دوور نەبوو و تەنیا جیاوازی نێوان ئەم دوانە رادەی خوێندن و هەستی شۆڕشگێڕی و توانایی بوو. بەم پێیە ئەم هێزانە لە بەراورد لەگەڵ ئەو هێزانەی کە لەگەڵ زۆرینەی کۆمەڵ مەودای چینایەتییان هەیە و خۆیان وەکو چینی باڵا دەست دەناسێنن، دوای شۆڕش و بە دروستی و بە رەوا داوای نوێنەرایەتی ویستی گشتی دەکەن.

ئەو چینە شۆڕشگێڕانەی تاکە پێشڕەون، هەر لەسەرەتای دامەزرانی حکوومەتەوە ناتوانن لایەنگیری زۆرینەی جەماوەر بەرەو خۆیان راکێشن. بەم حاڵە لەو وڵاتانەی ئیرادەی گشتی — جیا لە ئارمانی چینایەتی تایبەت — بەرەو ئاکام گەیشتنی مەبەست گەلێك، وەکو



سەربەخۆیی نەتەوەیی و چوونە سەرڕێی ئاستی ئابووری، وەڕێ دەکەوێ و، لە شوێنێك کە ئەم ویستە بەشێوەی لایەنگریی گشتی و هەمە لایەنە لە ئارادایە و لەو جێیەی کە لەماوەی قۆناغی دوورو درێژی کۆکردنەوەی سەرمایە بنیاتنانەوە ساغ کردنەوەی پێکهاتەیی، بەشێوەیەکی لەخۆ بوردووانە بوونی خۆی دەپارێزێ و بەهێنانە مەیدانی زۆرینەی خەڵك و هەڵسووڕاوکردنی ئەوان، خۆی قورس و قایمتر رادەگرێ، و لە کۆتاییدا لەو وڵاتانەی سیستەمی سیاسیی کارلێهاتووتر لە ئارادایە، دەتوانین بڵێین دیموکراسی-ش هەیە.

بە دیموکراتیك دانانی ئەم وڵاتانە بەو مانایەیە، کە لەسەر مەبەستەکانیان داکۆکی بکرێ، نەك ئەوەی کەرەسە و ئامێرەکانی گەیشتن بەو مەبەستانە وەبەرچاو بگیرێ. ئەمە بە مەبەست گەیشتنە کە پێوانە و مەرجی دیموکراتیك بوون دەست نیشان دەکا. ئەم تێگەیشتنە لە دیموکراسی پەیوەستە بەسەردەمی کلاسیك و پێش لیبرال. ((ژان ژاك رۆسۆ)) داڕێژەری کلاسیکیی ئەم بەرنامە دیموکراتیکە بوو و لە زۆربەی تیۆرەکانی رێبەرانی سیاسی وڵاتانی لە حاڵی گەشەدا، دەتوانین زایەڵەی بەرنامەی رۆسۆ ببیستین. ئەوان وەکو رۆسۆ لەنێو نابەرابەریدا بەدوای پەتای کۆمەڵایەتی، نەبوونی ئەخلاق، نەبوونی ئازادی مرۆڤایەتی و نزمبوونی بایەخی مرۆڤایەتیدا، دەگەڕێن. ئەم رێبەرانە وەکو رۆسۆ پێیان وایە کە وەدەست هێنانی ئازادیی راستەقینە و مرۆڤایەتی تەنیا و تەنیا لەڕێی ئیرادەی گشتی بە ئاکام دەگا، مرۆڤایەتی، ئازادی و پلەو پایەی ئینسانی دەبێ لەڕێی دامەزران و بووژانەوەی بەرابەری بێتە ئاراوە، بەرابەرییەك کە بە زۆرداری و فریودانەوە لێی ستێندراوە. ئەم کارە نیازی بەشۆڕشێك کەلتورڕێژی سیاسی و ئەخلاقی هەیە و لەسەر ئیرادەی نەتەوەیەك داکۆکی دەکا کە بەتەنیا ژێدەری مەشروع بوونی سیاسی دادەنرێ.

پێکهاتەی سەرەکی ئەخلاقی ئەم بەرنامەیە، بایەخی بەرزی ئازادی و رێزدانان بۆ مرۆڤایەتییە، ئەوەش خاڵی هاوبەشی نێوان بەرنامەی دیموکراسیی کلاسیك و بەرنامەی لیبراڵە. جیاکەرەوەی ئەم دوانەش پێداگرییە بە کردەوەکانی ئەوانە. لە دیموکراسیی

کلاسیکدا بەبێ وەبەرچاوگرتنی جیاوازییە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکان، لەسەر ئیرادەی گشتی داکۆکی دەکرێ و دیموکراسی نێو وڵاتانی لە حاڵی گەشەشدا، هەر ئەم وێنەیە دووپات دەکەنەوە.

بەم پێیە بەم دەرەنجامە دەگەین کە نەتەوەکانی لە حاڵی گەشەدا بانگەشەی چەشنێ دیموکراسی دەکەن کە نالیبراڵە. ئەوان تیۆرە گرینگەکان و تەوەری لیبراڵ دیموکراسی رەت دەکەنەوەو لەسەر هۆکارەکانی خۆیان پێدادەگرن. تەنیا خاڵی هاوبەشی ئەوان لەگەڵ دیموکراسیی لیبراڵ، ئامانجی ئازادی و رێزی مرۆڤایەتییە بۆ هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵگا.

هەنووکە دەتوانین بەئاشکرا هاوبەشی و جیاوازییە چەمکییەکانی دیموکراسی لەنێو وڵاتانی لە حاڵی گەشە و وڵاتە مارکسیستییەکاندا دەست نیشان بکەین. سەرەکیترین مەسەلە کە بۆتە کێشەی نێوان دیموکراسی لە حاڵی گەشەو مارکسیستەکان، هەڵسەنگاندن و توێژینەوەی چینایەتییە، کە لە چەشنی مارکسیستیدایە. بەڵام لەپێشدا دەبێ رووبکەینە ئەو واتایانەی کە وڵاتانی ژێر کاریگەریی گرێمانەی مارکسیستی پێی گەیشتوون.

ئەو شتەی کە دیموکراسی لە حاڵی گەشەدا پێی باش بووەو لەنێو مارکسیزمدا دەست نیشانی کردووە شرۆڤەی رەخنەگرانەی ئەم ئایدیۆلۆژیایەیە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری و، پێکهاتەیەکی ئەخلاقییە کە ئەم رەخنەیەی لە سەر دامەزراوە. لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کاتێ ((مارکس)) باسی مرۆڤایەتی سڕینەوە دەکا راستەوخۆ ئەوان بە بەردەنگ دادەنێ. شرۆڤەی مارکس لەبارەی ((لەخۆ نامۆ بوون))ی مرۆڤ یان بەواتایەك دوورخستنەوەو جیاکردنەوەی مرۆڤ لە عادەتی سروشتیی خۆی لەنێوان هەڵسوکەوتی سەرمایەداریدا، لێکدانەوەیەکە لەگەڵ بارودۆخی بابەتی و بەرچاوی ژیانی چەوساوانی ئەم دەستەیە لە کۆمەڵ هاوسەنگە و لە روانگەی ئەوانەوە لەبارەی تەوەری بناغەی هەلومەرجی ژیانی ئەوان دەدوێ. رەنگدانەوەی دیکەی ((مارکس)) ئەم باوەڕەی ئەوە کە مرۆڤ دەتوانێ لەرێی کردەوەی



شۆڕشگێڕانە بەسەر ئەم کەمایەسی و خەسارە مێژووییەدا زاڵ بێ، بەڵام سەرنج راکێشیی مارکسیزم تەنیا بەم دوولایەنە بەرتەسك دەکرێتەوە.

روناکبیرانی دنیای لە حاڵی گەشەدا تیۆری خەباتی چینایەتی ((مارکس)) وەکو تەنیا هێزی هاندەری مێژوو قبووڵ ناکەن و پێیان وانییە کە بۆ کۆمەڵگای خۆیان کارساز بێ. هەروەها تیۆری ئەویان (مارکس) قبووڵ نەکرد کە دەوڵەت کەرەسەیە بۆ باڵا دەستکردنی چینێك و دوای شۆڕشی دژی سەرمایەداری بمانەوێ و نەمانەوێ دەوڵەتێکی چینایەتی دێتە سەرکار. لەراستیدا ئەوان ئەمە قبووڵ ناکەن کە تەنیا رێی بزرکردنی کۆمەڵگای چینایەتی، دانانی دەوڵەتێکی چینایەتییە. ئەوان رەنگە قبووڵی بکەن کە ئەم تیۆرە سەبارەت بە وڵاتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکاندا وەڕاست دەگەڕێ، بەڵام لەبارەی وڵاتانی خۆیاندا بەدروستی نازانن. لایەنە تیۆرییەکانی ئەم ئایدیۆلۆژیایە لەگەڵ خوێندنەوەی ئەزموون کراوی ئەوان یەکتری ناگرنەوە، چونکە ئەوان لە کردەوەدا کۆمەڵگاکانی خۆیان بێ چین و توێژ دادەنێن. لە وێنەی تیۆریی ((مارکس))دا کۆمەڵگا بەدوو توێژی چەوسێنەر و چەوساوە دابەش دەکرێ، بەڵام لەوێنەی تیۆریی جیهانی سێهەمدا گشت کۆمەڵگا لەژێر فەرمانی هێزێکی چەوسێنەری بیانیدایە و لەناوەوە هیچ کەلەبەرێکی چینایەتی نییە. بە بۆچوونی ئەوان نەك هەر چینێکی تایبەت بەڵکو تەواوی کۆمەڵگا و نەتەوە، شکست خواردووی هێزێکی سەرمایەداریی بیانی-ن سەرمایەداری کە لەدەرەوە بەسەریاندا دەسەپێ نە تەنیا بەشێوەیەکی وردبینانە، توێژەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەی دابەش نەکردووە بەڵکو بەرەو کۆمەڵگایەکی تاڕادەیەك بێ چینایەتی هانی دەدا.

بەم هۆیە لەم وڵاتانەدا خەباتی دژە سەرمایەداری پێش ئەوەی بەشۆڕشێکی چینایەتی دابنرێ شۆڕشێکی نەتەوەییە. لە باشترین حاڵەتدا لەو سەرەوە کە ئەوان گشت خەڵك وەکو چینێکی دۆڕاو و ژێر دەست دەبینن، شۆڕشەکەیان شۆڕشێکی نەتەوەیی — چینایەتی- ە. ئەوان پێیان

وایە رزگاربوون لە چنگی سەرمایەداری بەرووخانی دەسەڵاتی ئیمپریالیزم، بەمانای سەرکەوتنی تەواوە بەسەر سیستەمێکی هێزی سیاسی و چینایەتییدا.

وڵاتانی جیهانی سێهەم پێیان وانییە کە لەدوای شۆڕشدا پێویستی بەدامەزرانی دەوڵەتی چینایەتی هەبێ بەڵکو دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا بەباش نازانن. هەر کە هێزی ئیمپریالیستی تێك بڕووخێ، ئیتر هیچ توێژێکی سەرمایەداری ناوچەیی نامێنێ هەتا دەوڵەتی پرۆلیتاریا بیهەوێ لەناوی بەرێ. بەم پێیە ئەوشتەی کە بۆ ئەوان پێویستە دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا (یان هەر چینێکی پێشڕەو بەناوی پرۆلیتاریا) نییە بەڵکو دیکتاتۆریی ئیرادەو ویستی زۆرینە (یان دەستەی پێشڕەو بەنێوی ئیرادەی گشتی) و دەسەڵاتدارییە بەسەر نەتەوەیەکی تاك و بێ کەلەبەر.

ئەم دەرەنجامە کە بەرهەمی راڤە و خوێندنەوەی خۆیانە لە شوێن و بارودۆخی نێو وڵاتانی جیهانی سێهەم، ئەمەش لەزۆربەی بوارەکاندا بەراستەقینە نزیکترە و ئاست و پلەی وڵاتە تازە سەربەخۆکانی لەچنگی داگیرکەر و مەودای ئەوان لەگەڵ وڵاتە کۆمۆنیستەکان نیشان دەدا. بەرنامەی کۆمۆنیستی و بزووتنەوە کۆمۆنیستییەکان تەنیا لەو شوێنانەدا دەتوانن خۆیان نیشان بدەن، کە بنەمای بابەتی و زەینی باشیان هەبێ، واتە لە وڵاتانێکدا کە دژایەتیی چینایەتی یان رکەبەریی چینایەتی بەرچاوە. لە ئاکامدا ئەم بەرنامەیە بۆ ئەو هەرێمانە بەکارهێنرا کە کێشەی چینایەتی بەڕاستی تیایاندا لەئارادا بوو، یان هێزە بارهاتووەکان لەم رێبازەدا رێکخرابوون. ئەم بەرنامەیە بە ئاشکرایی و راستەوخۆ لەسەر وڵاتانێکدا بەڕێوەدەچێ کە هیچ دابەشکردنێکی چینایەتییان بەخۆوە نەبینیوە.

بەڵام دەبێ سەرنج بدەین کە ئەم کێشەیە لە ئاکامی کردەوەی هێزە بیانییەکاندا رەنگە لەنێو چینەکانی وڵاتانی لە حاڵی گەشەدا سەرهەڵبدا، هەر بەوشێوەیەی کە لەوڵاتی ڤێتنامدا شتێکی وا روویدا. لەهەر شوێنێکدا هێزی بیانی دوای شۆڕشێکی رزگاریدەر یان سەربەخۆیانە ئەگەر بتوانێ دەست بەسەر بەشێك لە بزووتنەوەی جەماوەری دابگرێ، سیاسەت و مەبەستەکانی خۆی وەگەڕ بخا، بەڵام رەگی لە بزووتنەوەکەدا نەکوتابێ شەڕی ناوخۆیی دروست دەکا. ئەم شەڕە لە



هەمانکاتیشدا وەکو شەڕێکی چینایەتی دێتە بەرچاو، چونکە شەڕی ناوخۆیی بەبێ سەرنجدان بەوەی، کە بەرەیەکی لەژێر سێبەری بیانیدا بێ یان نەبێ، بەکێشەیەکی ناوخۆیی دادەنرێ. ئەم چەشنە شەڕە ناوخۆییە لانی کەم لەڕوانگەی لایەنەکەی تردا شەڕێکە لەنێوان کەسانێك، کە دەیانەوێ دەسەڵاتی هێزی بیانی (بۆ وێنە ئیمپریالیزم) و ئەوانەی نۆکەرن یان لەشەڕگەی ئەم هێزانەدا شەڕ دەکەن، بزربێ، واتە ئەڵقە لەگوێیانی ئیمپریالیزمی تالانکەر. ئەم هەلومەرجە کە دەبێتە هۆی وەها شەڕێك، لەکردەوەدا بەکێشەیەکی ناوخۆیی دادەنرێ. لەئاکامدا دانانی سنووری چینایەتی کە لە بنەڕەتدا نەبووە، سەرهەڵدەدا و لەلایەن دەرەوە دادەسەپێ.

بەم شێوەیە لەو وڵاتانەی وەها شەڕێك ئەزموون دەکەن، وێدەچێ کە لێکۆڵینەوەی چینایەتی مارکسیستی بەکەڵك دێ و بەرنامەی کۆمۆنیستی بەخێرایی قبووڵ دەکرێ، بەڵام ئەمە بابەتێکی بێ وێنەیە. لە زۆربەی وێنەکاندا بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەکان وەها خێرا پاشەکشەیان بەهێزە داگیرکەرەکان کردووە، کە ئەم لێکۆڵینەوە چینایەتییانە لەکار کەوتوون.

بەکورتی باسی جیاوازیی چەمکی دیموکراسیی نێو کۆمۆنیستەکان و وڵاتانی تازە سەربەخۆ-م کرد، هەروەها سەبارەت بە بانگەشەی دیموکراتیك بوونی دەوڵەتە تاك حیزبییەکان لە هەردوو بواردا دەوام و بانگەشەی ئەوانم لەنێو هەردوو لایەندا نیشاندا.

بەباوەڕی من لە بەرتەسکترین مانادا بانگەشەی ئەم وڵاتانە بۆ دیموکراتیك بوون لە بانگەشەی کۆمۆنیستەکان گونجاوترە، چونکە ئەوان لە کردەوەدا باشتر دەتوانن مەرجی دیموکراتیك بوونی حکوومەتی تاك حیزبی بە ئاکام بگەیەنن. ئەو سێ مەرجە بریتی بوون لە؛ چاودێریی نێو حیزبی لە نزمترین پلەوە، ئازادیی ئەندام بوون لە حیزبدا، چاوەڕوانیی بەجێ و گونجاوی حیزب لە هەڵسووڕانی ئەندامان.

هۆی ئەوە کە مەرجی ناوبراو زیاتر لەنێو وڵاتە داگیرکراوەکانی پێشوودا بە ئاکام دەگا هەتا لە وڵاتە کۆمۆنیستەکان، ئەمەیە کە لەم وڵاتانەدا (لە دۆخی داگیرکەر و هەروەها لە شۆڕشدا) جیاوازیی چینایەتی بەرچاو نەبووە. بەم هۆیە لەبەراورد لەگەڵ وڵاتە کۆمۆنیستەکاندا، لەنێو

وڵاتە داگیرکراوەکانی پێشوودا دوای شۆڕش هەست بەدانانی دەوڵەتێکی چینایەتی نەکراوە. لەبنەڕەتدا بوونی دەوڵەتی چینایەتی دەبێتە لەمپەر لەسەر رێی سێ مەرجی ناوبراو، چونکە لەدوای شۆڕشدا دەوڵەتێکی چینایەتی دەبێ ئەو چینە لەسەر رێ لابدا، کە لەمێژە دەسەڵاتدارە و لە کاتی گۆڕینی کۆمەڵگا و تێپەڕین لە کۆنەوە بۆ نوێ، سەرجەم نیشانە و لایەنە کەلتووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوێ دەبێ بگۆڕدرێ.

بەڵام بەشێوەی بەربڵاوتر بانگەشەی دیموکراتیك بوون، کە وڵاتانی لەحاڵی گەشە دەیکەن لەچاو بانگەشەی کۆمۆنیستەکان گونجاوتر و باشترە. لە چەمکی گشتی تردا دیموکراتیك بوون یانی رۆیشتن بەرەو کۆمەڵگایەکی یەکسان، کە تێیدا هەر مرۆڤێك دەتوانێ بەپلەی مرۆڤایەتی خۆی بگا، ئەو شتەی نەتەوە تازە سەربەخۆکانی لە حاڵی گەشەی سەرکەوتووتر کردووە ئەوەیە کە لە نێوانیاندا چینی جۆراوجۆر نەبێ. ئەم وڵاتانە بەبێ نیاز بەتێپەڕکردنی قۆناغی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا دەتوانن ئاوا بکەن؛ بەر بەرەکانێیەکی بێ چینایەتی لەگەڵ سروشت، هەوڵی هاوئاهەنگ، بۆ بردنە سەرڕێی ئاستی ژیان. بەر بەرەکانێیەك کە گشت مرۆڤەکان بە هەستکردن بەبەرابەریی تێیدا بەشداری بکەن.

بەم حاڵەش ئەم سەرکەوتنانە تووشی ناکامی و داماوی دێن. وڵاتانی لە حاڵی گەشە لە بەراورد لەگەڵ وڵاتە کۆمۆنیستییەکانی ئورووپادا، بۆئەوەی بە ئاستی بەرهەم هێنانی ماددی بگەن و تا ئەو جێیەی بتوانن ژیانێکی مرۆڤایەتی بۆ هەمووان دەستەبەر بکەن، رێگایەکی دوورو درێژیان لەبەرە. دیموکراسی بەسەرجەم ماناکانییەوە هەر تەنیا نیازی بە بەرابەری و هاوتایی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو نیازی بە سڕینەوەی هەژاری، نەزانی و نەخوێندەواری، پێش گرتن بە مەرگ، کە ناساغی هۆکاریەتی، هەیە. ئەگەر وڵاتانی کۆمۆنیستی و لە حاڵی گەشەدا پێکەوە وەها مەبەست گەلێکیان لەبەربێ، دەبێ دان بەوە دابنێن کە دەستەی یەکەم زووتر بە ئاکام دەگا. هەڵبەت ئەوە پێشبینی ناکرێ کە ئەوان تا چ رادەیەك سەرکەوتووتر دەبن.



بەراوردکردنی وڵاتانی لەحاڵی گەشە لەو روانگەیەوە کە بانگەشەی دیموکراسی دەکەن بەراوردێکی بێ بایەخە. هەر ئەوە بەسە کە تەنیا بوونی ئەم بانەگشەیە و پێکهاتەکەی واتە پێناسەی پێشتری دیموکراسی تاوتوێ بکەین کەلایەنی هاوبەشی ئەوانە.

لەویش گرینگتر هەڵسەنگاندنی هۆکارانێکە، کە ئەم وڵاتانەی لەسەر رێیەکی جیا لە دیموکراسیی لیبرال داگرتووەو رادەگرێ. دیموکراسیی لیبراڵ واتە سیاسەتی هەڵبژاردن — بۆ هەموو مافی هەڵبژاردن هەیە و لەسەر رێی هەڵبژاردن هەموو شتێ بەدی دەکرێ. بەواتایەکی تر هەموو شتێك، بێجگە لە کۆمەڵگای لیبرال و مافی دەنگی دیموکراتیك. ئایدیالی دیموکراسیی لیبراڵ بریتیە لە مافی دەسەڵاتی بەکارهێنەران- ئێمە بەو مافە دەنگەی کە هەمانە، هەر شتێکی کە بمانەوێ دەیکڕین. وڵاتێکی لە حاڵی گەشە دەرەقەتی راگرتنی ئەم چەشنە دەسەڵاتەی بەکارهێنەر نایە، چونکە لەبنەڕەتدا وەها کەلوپەلێکی سیاسیی نییە تاکو نیشانی بدا. هەر کە نەتەوەیەکی دواکەوتوو بیەوێ سەربەخۆ بێ بەقۆناغێك لە کردەوە دەگا کە زۆربەی هەڵبژاردنەکانی ئەو (نەتەوەیە) زەوت دەکا.

تەواوی هێزی دەوڵەت دەبێ لەرێی پەرەسەندنی ئابووری بەکاربهێنرێ. کاتێ هەڵبژاردنێکی گەورە بەڕێوە دەچێ پێش بە هەڵبژاردنە گچکەکان دەگرێ، کە ناسێنەری سەرەکیی دەوڵەتی لیبرالە. دەوڵەتە نوێیەکان ناتوانن لە سیاسەتی دوا هەڵبژاردن(٥) کەڵك وەربگرن. ئێمە لە رۆژئاوادا خودی حکوومەت بە کەرەسەیەکی بەکارهێنانی دادەنێین.

بەکارهێنەران دەبێ حکوومەت بە بەرهەم هاتوو یان سەرمایەیەك دابنێین، کە وەکو سەرجەم سەرمایەکان راستەوخۆ چاودێریی ناکرێ، بەڵکو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لە درێژەی قۆناغێکی درێژ ماوەدا، بەوە بەرچاوگرتنی مافی هەڵبژاردنی بەکارهێنەران کۆنترۆڵ دەکرێ.

## ليبرال ديموكراسى وەكو سيستەمى دەسەڵات

تا بە ئێرە لەسێ چەمكى ديموكراسى دواين، كە هەر كاميان لە چەشنێكى تايبەت لە كۆمەڵگا و لە قۆناغێكى گەشەكردندا پێ گەيشتوون. ديموكراسيى رۆژئاوايى، كە ئێمە پێى دەڵێين ديموكراسيى ليبرال، بەمەبەستى بە ئاكام گەياندنى نيازەكانى كۆمەڵگاى ركەبەريى پشت بەستوو بە بازاڕ، پێكهاتووە. يەكێك لەدوا دەسكەوتەكانى كۆمەڵگاى بازاڕى، ديموكراسيى ليبرال-ە، يەكەم پێويستى وەها كۆمەڵگايەك دەوڵەتى ليبرال بوو، كە بەدەوڵەتى ديموكراتيك دانەدەنرا. دەوڵەتێكى ليبرال كە دەبوايە لەرێى ركەبەريى نێوان حيزبە سياسييەكانى وەڵامدەرى دەنگدەران، بەشێوەى ناديموكراتيك ئيدارە بكرابوايە. مافى دەنگى ديموكراتيك تەنيا كاتێ لە پەناى ليبراليزمى دەوڵەتييەوە هاتە ئاراوە كە چينى كرێكارى پێگەيشتوو، لە فەزاى سەرمايەداريى پشت بەستوو بە بازاڕ سەرى هەڵدا بوو و بۆ هاتنە نێو مەيدانى ركەبەريى و لەرەوتى ركەبەرييدا شوێنێكى بۆ خۆى ديارى كرد. بەم پێيە ديموكراسيى ليبرال تاكە دەسكەوتى كۆمەڵگاى بازاڕە سەرمايەدارييەكانە كە بەسەركەوتووييەوە لە حاڵى گەشەدان.

لە لێكۆڵينەوەى دوو چەشنى ناليبرالدا بينيمان كە ئەم دووچەشنە لەچاو چەشنى ليبرال، لە چەمكى سەرەكيى ديموكراسيى (حكوومەتى هەژاران و ستەم لێكراوان و هەروەها حكوومەت بۆ هەژاران و ستەم لێكراوان) نزيكترن، واتە چەمكێ كە هيچ پێوەندييەكى لەگەڵ لايەنى ليبرال نييە. گوتمان كە لە ئايديۆلۆژياى كۆمۆنيزمدا چەمكى نوێى ديموكراسى لە هەمان بۆچوونى كۆنەوە سەرچاوەى گرتووەو، تايبەت كراوە بەتوێژێكى كۆمەڵايەتى و قۆناغێكى مێژوويى ديارى كراو. بەواتايەكى تر لە بۆچوونەكانى ماركس و لێنيندا ديموكراسى پێش هەموو شتێك هەمان حكوومەتى پرۆليتاريا بوو. ئەم چەشنە لە ديموكراسى بە چەشنێ لە



دەوڵەتى چينايەتى دادەنرێ كە بەهۆى شۆڕشى پرۆلتاريەوە بە ئاكام دەگەيشت و ئەركەكەى تێك رووخاندنى چينە دەسەڵاتدارەكانى (پێشوو) بوو و هاوتەريب لەگەڵ ئەويشدا گۆڕينى دانوستاندنى كۆمەڵايەتى بەرەو دانوستاندنێك كە چەوسێنەر نەبوو و لە ئاكامدا كۆمەڵگايەكى بێ توێژ و بێ نياز لە دەوڵەتى چينايەتى دانرا. بەم شێوەيە (بە بۆچوونى ماركس و لێنين) تەنيا ديموكراسيى چينايەتى دەيتوانى كۆمەڵگايەكى سەر لەبەر مرۆڤايەتى دەستەبەر بكا.

سەرەنجام، چەمكێكى سێهەممان لە ديموكراسى نيشاندا كە نەليبرال بوو نەكۆمۆنيست. ئەم چەشنە ديموكراسييە لە وڵاتە تازە سەربەخۆكان و وڵاتانى لە حاڵى گەشەى جيهانى سێهەمدا باوە. لەم ديموكراسييەدا تايبەتمەنديى ركەبەر ئاساى كۆمەڵگاى پشت بەستوو بە بازاڕ رەت دەكرێتەوەو هيچ نيازى بەبوونى حيزبە سياسييە ركەبەرەكان نييە. ئەم چەشنە ديموكراسييە هەرچەند قەوارەى تاك حيزبى بۆ حكوومەت هەڵدەبژێرێ، بەڵام وەكو كۆمۆنيستەكان باوەڕى بە پێكهێنانى دەوڵەتى چينايەتى دواى شۆڕش نييە. لەجێى ئەوە باوەڕى بە دانانى دەوڵەتى بێ نێونجى هەيە بۆ رەنگدانەوەى كۆمەڵگاى بێ چين وتوێژ. لەم روانگەيەدا ديموكراسى دەبێتە حكوومەتى ئيرادەى گشتى (ويستى زۆرينە) و ئەو كاتەش كاتى دەسپێكى گەيشتن بەسەربەخۆيى نەتەوەييە.

لە دنياى راستەقينەدا، ديموكراسى لەم سێ چەشنە پێكهاتووە، نەك ئەوەى تەنيا چەشنێكى وەخۆگرتبێ. دروست نييە ئەگەر وابير بكەينەوە كە ديموكراسى هەموو ديموكراسى ليبرالى رۆژئاوايە، چونكە يەكێتى سۆڤيەت يان وڵاتانى جيهانى سێهەم-يش هەر ئەو ديموكراسييە بەوێنەى بێ خەوشى ديموكراسى دەزانن كە لە هەرێمى خۆياندا باوە. لەراستيدا ئەم سێ چەشنە ديموكراسييە هێندە جياوازن كە رەنگە لە خۆمان بپرسين ئايا وشەى ديموكراسى دەتوانێ نيشاندەرى ئەم سێ چەشنە بێ؟ ئايا دەتوانين ناوێك لەسەر ئەم سێ بوونەوەرە

جیاوازە دابنێین؟ ساناترین وەڵام ئەوەیە کە لەراستیدا ئەوان ناوێکیان هەیە. هەڵبەت رەنگە رەخنە بگیرێ کە کۆمۆنیستەکان و جیهانی سێهەم بە قازانجی خۆیان کەلکیان لەم وشە جوانەی رۆژئاوا وەرگرتووە و لەگەڵ مەبەستەکان و سیستەمی سیاسیی خۆیان بەراوردیان کردووە. لە رواڵەتدا ئەمە باوەڕی زۆربەی رۆژنامەوانان و بڵاوکەرەوانی ئێمەیە، کە زیاتر لەگەڵ دانوستاندنی کۆمەڵایەتی هەڵسوکەوت دەکەن هەتا لەگەڵ دیموکراسی. بەڵام ئەم باوەڕە هەر بەو شێوەیەی بینیمان هەڵەیە. دیموکراسی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر پێشتر لە دیموکراسیی لیبرال-ی ئەمڕۆیی و نالیبرالی هەنووکەیی، تێگەییشتنی نالیبراڵی ئەمڕۆیی لە دیموکراسی، هەر لە پێناسە کۆنەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە.

کاتێ هەرسێك چەمکی دیموکراسی بەتەواوی تاووتوێ بکرێن ئەمە روون دەبێتەوە، کە بۆچی دەبێ هەرسێکیان ناوێکیان لەسەربێ. ئەو سێ چەمکە لە خاڵێکدا هاوبەشن؛ هەموویان بەرەو مەبەستێك دەڕۆن و ئەویش دانانی هەلومەرجێکە بۆ پێگەیشتن و کامڵ بوون و بەکارهێنانی توانایی و پێوانە مرۆڤییەکانی هەر کام لە ئەندامانی کۆمەڵگا. خاڵی جیاوازی نێوان ئەم دیموکراسیانە لە چەشنی ئەو بارودۆخەیە، کە بۆ مەبەستی ناوبراو پێویستە و هەروەها لە چۆنایەتی و رێگەی گەیشتن بەم بارودۆخەدا لەبەرچاودەگیرێ. ئەوانەی لەهەر کام لەم سیستەمە دیموکراتیانەدا دەژین، پێیان وایە کە شێوەو هەڵسوکەوتی دوو سیستەمی تر ناتەواوەو مەحکوومە بە شکست. جیاوازیی روانگەکان کە بەگشتی لەسەر ئامرازەکان و رێی گەیشتن بە دیموکراسی دامەزراوە، مەبەستی هاوبەشی هەرسێ چەشنی دیموکراسی لەبەرچاو دەگرن.

هەنووکە ئەگەر سەرنج بدەینە وێنەی بەکارهێنراو و بابەتی دیموکراسی دەبێ بەم دەرەنجامە بگەین کە قورسایی بەقازانجی دیموکراسیی لیبرال یان دیموکراسی چەشنی رۆژئاواییە، بەڵام ئەم بۆچوونە ناتەواوەو گشت راستییەکان وەخۆناگرێ، چونکە زۆربەی ئەوانەی باوەڕیان



بەدووچەشنی تری دیموکراسی هەیە، پێیان وایە کە دیموکراسیی مەبەستی ئەوان، باڵا دەست و دروسترە - هەڵبەت ئەوان ناڵێن کە دیموکراسیی مەبەستی ئەوان ئازادییەکی زیاتری بەخەڵك داوە، بەڵکو بانگەشەی ئەمە دەکەن کە کاتێ هیچ کام لەم سێ دیموکراسییە هێشتا نەیانتوانیوە لە کردەوەدا بە ئامانجی ئەخلاقیی دیموکراسی بگەن، ئەوان بەرێگای دروستی گەیشتن بەم ئامانجەدا دەڕۆن و ئێمە (لیبرالیزمی رۆژئاوا) لە کۆتایی بەلاڕێ دارۆیشتنی خۆمان داین.

ئەگەر هەر کام لەم سێ وێنەیە دەیانتوانی جیاو سەربەستانە رێی خۆیان بپێون، جیاوازیی بۆچوونەکان زۆر گرینگ نەدەبوون. هەرکامیان دەیانتوانی بەپێی بنچینەی ئەخلاقی و ئامانجی خۆیان، خۆیان لەمەحەك بدەن و بانگەشەی ئەمەبکەن کە دەیانەوێ بە مەبەستی ناوبراو بگەن یان نەگەن. بەڵام دەزانین کە لە کردەوەدا هیچ کامیان ناتوانن بەشێوەی جیاو سەربەخۆ بەرەو پێشەوە بڕۆن. لەدنیای ئێمەدا و لە روانگەی تەکنیکییەوە دووبەشی پێشکەوتوو و گەشەکردوو لەگەڵ یەکتری رکەبەریی دەکەن و هەرکامیان پێیان وایە کە داهاتوو هی ئەوانە و بەشێوەو کەرەسەو رێگاکانی تایبەت بەخۆیان هەوڵ دەدەن وەها داهاتوویەك بەدەست بێنن.

لە رواڵەتدا ئێمە سەردەمی دزێوی شەڕی ساردمان تێپەڕ کردووە، بەڵام هەنووکە هێزەکانی هەردوو لایەنی دژبەیەك لەو شەڕەدا لەرێی گەشە و بە ئاکام گەیشتنی ئامانجە دیموکراسییەکان رکەبەریی دەکەن و بەئاسانی لە هەڵوێستی خۆیان ناکشێنەوە. ئێمە لە رۆژئاوادا وردە وردە بەم راستییە دەگەین کە تا چ رادەیەك دوورکەوتنەوە لە سیستەمێکی شەڕیین دژوارە. هەروەها رمانی خۆرۆشچۆف لە یەکێتی سۆڤیەت نیشانیدا کە ئەم کێشەیە بۆ دنیای کۆمۆنیستی-ش لە ئارادایە. بەڵام لەم نێوانەدا دنیای نوێی ئەفریقا و ئاسیای لە حاڵی گەشە، کە لەسەر هێڵی خێرای گەشەسەندن دان، بەجیهانی سێهەمی دادەنرێن و

لەسەر هەردوو جیهان کاریگەربوون. ئەم راستییە لە روانگەیەکەوە نیشانەی وریایی رۆژئاوایە، لە لایەکی تریشەوە کێشەیەکە بۆ بەرەی کۆمۆنیست-ی.

بەمجۆرە ئێمە ئێستا لەچاو بارودۆخی هێزی بەرگری و یەکەم پەرەپێدانی دیموکراسیی لیبرال لە ئاستێکی جیاواز داین. ئێمە ئیتر دەرفەتمان نییە هەتا وێنەیەکی زەینی لە لیبرال دیموکراسی پێك بێنین و بەباشترین و گونجاوترین وێنە لەگەڵ سرووشتی مرۆڤایەتی هاوتای بکەین. ئێمە بەشێوەیەکی رەخنەگرانە بڕوانینە ئەو شتەی کە لە کردەوەدا دەمانتوانی ببین. ئەم کارە تەنیا لەبەر پاراستنی خۆیان نییە بەڵکو لەبەر ئەمە ئەنجامی دەدەین کە بناغەیەکی هیوا بەخش دابڕێژین تا بەپێی ئەو بناغەیە تێڕوانینی سەرکەوتوویی مرۆڤایەتی خۆمان بەسەرتر و گونجاوتر بزانین. هەر کە سەرنج بدەین دەبینین کە روانگەی سەرکەوتوویی مرۆڤ تا چ رادەیەك تووشی بەرتەسکی هاتووە، روانگەیەك کە دەسەڵاتداری کۆمەڵگای ئێمەیە و ئێمە تا بە هەنووکە و هەر لە کردەوەشدا بەو پێیە جووڵاوینەتەوە. ئەم روانگەیە پێوەندییەکی قووڵ و راستەوخۆی لەگەڵ بازاڕ هەیە و ئەم راستییە تاڵە ئەوەیە کە ئەم دیمەنە، دیمەنێکە لە پچڕ پچڕی، کپی و سستی. کەس باوەڕ ناکا کە قبووڵی بکەین کۆمەڵگایەکی دانوستاندن تەوەر کە لە بنەڕەتدا دەبێ چالاك بێ، لەسەر ئەم گریمانەیە راوەستاوە، کە مرۆڤ وەها سست و بێ جووڵەیەو وەها لەگەڵ چالاکی و ماندوویی نامۆیە، کە بەکارێکی تاقەت پڕوکێن و بەزاراوەی ئابووری ناسان، بێ کەڵك دەزانن. ئەم فەڕزە کە سانسۆرکردنی ئاشکرای بارودۆخی مرۆڤایەتییە، راستەوخۆ تیۆری کۆمەڵگای بازاڕ و هەر بەم شێوەیە کۆمەڵگای لیبرالی دەپێکێ. کۆمەڵگای لیبرال و کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ زۆرجار بەم بۆچوونە ئاگادار دەکرێنەوە کە بەدوای زۆر کردنی قازانجن، یان بەواتایەکی تر لەم چەشنە کۆمەڵگایانەدا خەڵك بە کەمترین ماندوو بوون نیازەکانی خۆیان دابین دەکەن. ئەم باوەڕە، کە خودی هەڵسووڕان و چالاکی (ئابووری یان بژیوانە) کارێکی پڕچێژ و متمانە بەخشە، لەتوێی ئەم روانگە قازانج خوازانەیەدا و بەبێ هیچ شوێن پێیەك، شاردراوەتەوە. ئەم بۆچوونە سەیرو



سەمەرە نییە چونکە ئابووری ناسان و بەدوای ئەواندا تیۆرناسە لیبرالییەکان، کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە کۆمەڵگایەك دەزانن کە تێیدا هیچ کەسێ چالاکی لەخۆی نیشان نادا مەگەر بۆ بەدەست هێنانی پاداشت (قازانج). بۆ ئەوەی بێ ناوەرۆك بوونی ئەم روانگەیە روون بێتەوە، هەر ئەوندە لە خۆمان بپرسین کاتێ ئۆتوماسیون، سیبرناسیون و سەرچاوە نوێیەکانی هێزی نامرۆڤی بێن و سیستەمی هەڵسووڕانی ئابووریی بخەنەوە دەست بگرن و پاداشتی مادی بێ بایەخ بکەن، ئەو کات ئێمە چ بکەین؟ بەڕاستی لەو کاتەدا بێجگە لەبەر فراوان کردنی هێزی خۆمان بۆ ئەو هەڵسووڕانانەی بەڕاستی مرۆڤایەتی—ن (یاری، پێکەنین، مەشق، فێربوون، داهێنان، بەڕێوەبردنی ژیان بەشێوەی جوانیناسانە و بە ئاکام گەیاندنی پێویستییە عاتیفیەکان) خەریکی چ کارێکی تربین؟

بەڵام دەبێ چاو بەو روانگە پووچ و بێ ناوەرۆکە دابخشێنینەوە کە هەنووکە دەسەڵاتداری ژیانمانە و لە خۆمان بپرسین، کە مەنتیقی دیموکراسیی لیبرال چۆن لەگەڵ ئەو روانگەیە پێوەندی دەگرێ. یەکەم شتێ کە دەبێ لێی وردبینەوە ئەوەیە کە دیموکراسیی لیبرال وەکو سەرجەم سیستەمە کۆمەڵایەتی و حکوومییەکانی تر، سیستەمی دەسەڵاتە.

لە شوێنێکی وتارەکانی پێشوودا ئاماژەم کرد، کە دیموکراسیی لیبرال واتە سیاسەتی هەڵبژاردن. بەڵێ هەروایە، بەڵام ئەم سیستەمە لە هەمانکاتیشدا سیستەمی دەسەڵاتە. لەراستیدا دیموکراسیی لیبرال وەکو هەموو سیستەم و پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، بریتیە لە سیستەمی دوو چەشنەی دەسەڵات. هەر سیستەمێکی حکوومی لە ئاشکراترین حاڵەتی خۆیدا سیستەمێکە لە دەسەڵات. حکوومەت دەوڵەتێکە کە دەبێتە هۆی داڕێژرانی کۆی یاسا و رێسایەك بۆ ئەوەی خەڵك بەپێی ئەم یاسایە بجووڵێنەوە. ژێدەری دەسەڵات لەهەر کوێوە بێ بەشێك یان گشت جەماوەری کۆمەڵگا ناچار دەکا، کە چەند کارێك ئەنجام بدەن یان نەدەن. ئەگەر مرۆڤەکان پەڕیلان بوایەن ئەوکات هیچ پێویستییەك بە حکوومەت



PDF 4 KURD

نەدەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی مرۆڤەکان پەڕیلان نین هەر بەم پێیەش حکوومەت پێویستە و مانای حکوومەت دەبێ ئەوەبێ کە دەسەڵاتداران ژێر دەستانی خۆیان ناچار دەکەن. لەو سەرەوە کە لیبراڵ دیموکراتەکان هەمیشە ئەم راستییە بناغەییەیان جیاکردۆتەوە، پێداگرییان لەسەر ئەم بنچینانە کردووە، کە ژێر دەستان دەبێ مافی هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارانیان هەبێ و هەروەها مافی ئەوەیان هەبێ کە دەسەڵاتداران بخەنە ژێر چاودێرییەوە. ئەمە نیشانەی کۆمەڵگای شارستانییە، کە تێیدا توندوتیژی قەدەغەیە و توندوتیژی وەکو هێزی فشار و هێزی فیزیکی یان گوشار دانان، بە چەشنێ تایبەتی کردنی دەسەڵاتی حکوومەت دادەنرێ. لەم روانگەیەوەیە کە ئێمە دەبێ لەبیری خستنە لەژێر چاودێریی حکوومەت دابین.

بەم جۆرە بەپێی باوەڕی لیبرالترین دیموکراتەکان، دەوڵەتی لیبرال دیموکراتی وەکو هەر دەوڵەتێکی تر سیستەمێکی دەسەڵاتە. ئەو شتەی کەمتر سەرنجی پێدراوە ئەوەیە کە دیموکراسیی لیبرال لەلایەکی تریشەوە بە سیستەمی دەسەڵات دادەنرێ، یانی دەوڵەتی دیموکراتیی لیبرال وەکو هەر دەوڵەتێکی تر بۆ پاراستنی پێوەندیی دەسەڵاتی نێو خەڵك و دەستەکانی نێو کۆمەڵگا پێکهاتووە. ئەمە ئەندێشەیەکی ئەزموون نەکراو و نوێیە کە دەبێ زیاتر تاوتوێ بکرێ. بێگومان ناعاقڵانە دەبێ ئەگەر لەنێو پێوەندییەکانی دەسەڵاتدا سەرلەبەری دانوستاندن و پێوەندییەکانی نێوان جەماوەری کۆمەڵگا بەرتەسك بکەینەوە، هەر چەندیش ناسراوترین بیرمەندی سیاسی و تیۆری نووسی تاکخوازیی مۆدێڕن (مەبەستم تووماس هابز-ە کە ٣٠٠ساڵ لەمەوپێش بەپێکهاتەی هەنووکەیی کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ و پێداویستییەکانی زانیبوو) هەر ئەم کارەی کردووە. هەڵبەت ناتوانرێ گشت پێوەندییەکانی نێوان خەڵك —واتە نێوان من و ئێوە- هەتا رادەی پێوەندیی دەسەڵات نزم بینەوە. لەنێوان جەماوەری کۆمەڵگادا، بێجگە لە پێوەندیی دەسەڵات، پێوەندیگەلی تری وەکو دۆستایەتی، خزمایەتی، هاوکاری، هۆگریی هاوبەش و... تاد هەن، کە بەئاسانی



ناتوانرێ تارادەی پێوەندییەکانی دەسەڵات نزمیان بکەینەوە. هەرچەند لە هەرکامیاندا توخمێەك لە دەسەڵات بەدی دەکرێ.

زۆربەی پێوەندییە مرۆڤایەتییەکان وەکو پێکهێنانی ژیانی هاوبەش، بە ئاوێتە بوونێك لە پێوەندییەکانی دەسەڵات و بێ دەسەڵات دادەنرێن و چوارچێوەکانی بەپێی زەمان دەگۆڕدرێن. پێشتر پێکهێنانی ژیانی هاوبەش پێوەندییەکی کۆیلانە بوو، بەچەشنێ کە ژن بەمڵکی پیاو دادەنرا، بەڵام هەنووکە ئەم پێوەندییە ئاوانییە. گۆڕانێکی کە بەسەر ئەم مەسەلەیە داهاتووە رەنگە بەهۆی سەرهەڵدانی دەوڵەت بەدی هاتبێ. بەگشتی دەتوانرێ بگوترێ، کە لە نێوان هەموو چەشنە پێوەندییەکانی جەماوەردا تەنیا پێوەندی دەسەڵاتە، کە دەکەوێتە نێو هەرێمی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە. تەنیا ئەم چەشنە پێوەندیانەن، کە بۆ پتەوبوون پێویستییان بە دەوڵەت هەیە. تەنیا دەسەڵاتە، کە پێویستی بەهێز هەیە و تەنیا دانوستاندنی دەسەڵاتە کە بۆ پاراستنی خۆی پێویستی بەهێزێکی سەرتر هەیە. لێرەدا سەرلەبەری پێوەندییەکانی هێزی نێوان جەماوەر لە کردەوەدا پێویستی بەهێزی دەوڵەت یان دەسەڵات هەیە.

بوونی دانوستاندنی دەسەڵات و پێویستیی هەبوونی دەوڵەت بۆ تۆکمەبوون و وەرێ خستنی هێز، بێجگە لە کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ، لە کۆمەڵگاکانی تریشدا بە ئاشکرایی دەبیندرێ. بەشێکی کۆمەڵگا لە کۆیلەکان پێکهاتووە، بێ گومان پێوەندییەکانی نێوان ئاغا و کۆیلە لە چەشنی پێوەندیی دەسەڵاتە. بەم پێیە دەوڵەتی دەسەڵاتداری ئەو کۆمەڵگایە بۆ بەهێزترکردن و پتەوترکردنی ئەو چەشنە لە دانوستاندن، کاردەکا. بەم شێوەیە، لە کۆمەڵگایەکدا کە بەپێی هێزو دابەشکردنی دەسەڵاتی نێوان خەڵك ئیدارە دەکرێ و بەرهەمەکانیش هەر بەم شێوەیە دابەش دەکرێن، پێوەندییەکانی دەسەڵاتی نێوان خەڵك دەبیندرێن کە حکوومەت بەڕێوەیان دەبا. لەوەها کۆمەڵگایەکدا دەستەیەك لە جەماوەر لە دەسەڵاتی دەستەکانی تر قازانج وەردەگرن. ئەم چەشنە هەڵسووکەوتەی دەسەڵات لەرێی

دامەزراوە یاساییەکان موڵکایەتی، دەپارێزرێن و یارمەتییان دەدرێ. تەنانەت خودی مرۆڤەکانیش رەنگە ببنە سەرمایەی مەشروعی مرۆڤەکانی تر، هەر بەو شێوەیەی کە لە سیستەمی کۆیلایەتیدا باوە. بەڵام ناتوانرێ ئەم بنچینەیە تا ئەو شوێنە گشتی بکرێ، کە بەشێك لە خەڵك لەو روانگەیەوە، کە دەتوانن هێزی سروشتی دیتران بەرەو خۆیان بگوازنەوە، گوشار بخەنە سەردیتران، هەر ئەوە بەسە کە بەشێك لە دەستە یان چینە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ مافی موڵکایەتی (تاك) و یاساییان هەبێ، ئەویش لە بابەت ئەو شتانەی کە مرۆڤ بەبێ وەچنگهێنانی ئەوان ناتوانێ لەهێزی سروشتی خۆی سوود وەرگرێ (مەبەست کەرەسەی بەرهەم هێنانە)، بەم پێیە ئەگەر سەرجەم ئەو سەرمایانەی کە بەشێوەی زەوی و موڵك-ن، لەدەستی چینێکی باڵا دەست بۆ وێنە کۆمەڵی فیۆدالی، دابێ، چینە ژێردەستەکان ناچارن لەژێر چاودێریی ئەواندا بجووڵێنەوە، چونکە لە کۆمەڵگایەکدا کە بەپێی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان ئیدارە دەکرێ، مرۆڤی بێ زەوی هیچ شتێکی نییە هەتاکاری لەسەر بکاو بژێو بەدەست بێنێ. توانا سروشتییەکانی مرۆڤ لانی کەم بریتیە لە هێزی باهۆ، پسپۆڕی، توانایی لەش. بەڵام لەم هێزانە کەڵك وەرناگیرێ، مەگەر ئەوەی هۆکارێك هەبێ کە وزە نادیارەکان وەگەڕ بخا. هێزی مرۆڤ ناتوانێ بەکاربهێندرێ و بێتە ئاراوە مەگەر هۆکارێك بۆ وەکارخستنی ئەو هێزە هەبێ. مرۆڤ دەبێ ئامرازی کاری بەدەستەوە بێ.

بەم پێیە دیتران بۆ وەدەستهێنانی سەرجەم سەرمایەکان وەکو کەرەسەی کارو زەوی، کە شیاوی کارن و لەلایەن دامەزراوە یاساییەکان لە خزمەت بەشێکی کۆمەڵگا دادەنرێن، دەبێ نرخێ بدەن. ئەم نرخانە رەنگە بەشێوەی کاری زۆرەملێ (نەخواستراو)، (بۆ وێنە لە مانگدا چەندین رۆژ کارکردن لەسەر زەوی ئاغا) یان تەسلیمی بەشێکی بەرفراوان لەبەرهەمەمێك بێ، کە لە ئاکامی عارەقە رشتن-ی خودی تاك بەدەست هاتووە. یان تەنانەت بەشێوەی بەکرێ گرتن (هێزی کار) بێ. هەرچۆنێك بێ لەراستیدا ئەمە گواستنەوەی زۆرەملی یان



نەخواستراوی بەشێك لە دەسەڵات (هێزی کار)ی مرۆڤێك یان بەرهەمی ئەم هێزە کارە بووە بۆ مرۆڤەکانی تر.

ئەمە چەشنێ پێوەندی هێزە کە بەپێی ئەو پێوەندییە بەشێك لە جەماوەر بەهۆی ئەوەی خاوەنی کەرەسە بەرهەم هێنەرەکانن دەتوانن وزەو هێزی کاری دیتران بەرەو خۆیان بگوازنەوە. ئەمەش لەو کۆمەڵگایانەدا دەبیندرێ کە موڵکایەتیی کەرەسە بەرهەم هێنەرەکان تایبەت بەتوێژ یان دەستەیەکە. لەبنەڕەتدا شۆڕشە مەزنە لیبراڵییەکان لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدە بەهۆی دژایەتی لەگەڵ وەها پێوەندییەکی پتەو سەریان هەڵدا.

ئەم شۆڕشانە گۆڕانیان بەسەر سیستەمی موڵکایەتی داهێناو چەشنێ دەوڵەتیان دامەزراند کەمن پێی دەڵێم دەوڵەتی لیبراڵ. بناغەی ئەم دەوڵەتە نوێیە لەسەر تایبەت نەکردن یان تەنگەبەرکردنی موڵکایەتیی ئامرازی بەرهەمهێنان دامەزرا بوو. لەو کاتەوە، گشت جەماوەری کۆمەڵگا بەمافی موڵکایەتیی سەرمایە و زەوی و هەروەها ئازادی پێشکەش کردن گەیشتوون یان توانیویانە بە باشترین نرخ لە بازاڕی ئازاددا کەرەسە بەرهەم هێنەرەکان بکڕن. تا کاتێ رکەبەرایەتی ئازاد، بێ بازاڕیش هەر بەڕادەی بەشداری کردن لە بەرهەمهێنان قازانج بە ئەندامان دەگەیەنێ. بازاڕ، لەرێی ئامادەکارییەکی گشتی ئەم کارە ئەنجام دەدا واتە بەشێوەی ئازاد و نووسینی بەڵگەنامە. ئەرکی دەوڵەتی لیبراڵ بریتیە لە لایەنگری و بەڕێوەبردنی میکانیزمی بڕیاری ئازاد و زەمانەتکردنی مافی موڵکایەتی، کە هەر کەسێك لەرێی کارکردن یان بەڵگەنامە بەدەستی هێناوە.

تەنیا دەوڵەتی لیبراڵ بوو، کە توانی ئەم مەبەستە بخاتە گەڕو لەگەڵ ئەوشتەی دەوڵەتە نالیبراڵییەکان دەیانکرد، زۆر جیاواز بوو. دەوڵەتی لیبراڵیش بەکەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات، پێوەندی گەلێك بەسەر خەڵکدا دەسەپێنێ، بەڵام ئەم پێوەندییانە زۆرەملێ یان نەخواستراو نین. ئەم پێوەندییانە وەها نین کە بەپێی ئەوان (پێوەندییەکان) کەسێ بتوانێ چەوسێنەر بێ

یان هێزی کاری دیتران بۆخۆی تەرخان بکا بەم شێوەیە ئێمە چۆن دەتوانین بانگەشەی ئەمە بکەین کە دەوڵەتی لیبرال لە هەمانکاتی زەمانەتکردنی کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ، سیستەمێکی دوو چەشنەی دەسەڵاتە، یانی دروست بەو شێوەیەی دەوڵەتە نالیبراڵییەکان چەشنێ گواستنەوەی زۆرەملێیانە-ی دەسەڵاتیان زەمانەت دەکرد؟ سیستەمی حکوومەت تەنیا کاتێ بەدوو چەشنی دادەنرێ، کە ئەم پێوەندیانەی لە نێوان خەڵکدا دروستیان دەکا لە چەشنی پێوەندیی دەسەڵات بێ. لە روانگەی ئێمەوە ئەم پێوەندیانە لەو چەشنەن کە بەپێی ئەوان (پێوەندییەکان) تاقمێك لەهێزی دیتران سوود وەردەگرن و یان لەم رێگایەوە بەدەسەڵاتی زیاتر دەگەن.

بەو شێوەیە پێش ئەوەی بتوانن بە دەوڵەتی لیبرال بڵێین سیستەمی دوو چەشنەی دەسەڵات دەبێ نیشان بدەین، کە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕ، کە بناغەی دەوڵەتی لیبرال پێك دێنێ، سیستەمێکە کە تێیدا و لە تۆڕێك لە پێوەندییەکان دەسەڵات لەنێو خەڵکدا ئاڵوگۆڕ دەکرێ، لێرەدا سەلماندنی ئەم مەسەلەیە دژوارنییە.

بۆ نیشان دانی ئەم راستییە، پێویست ناکا بەدوای رەوتی مێژوویی پێکهێنانی کۆمەڵگا بازاڕییەکان دابڕۆین، کە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا سەریان هەڵداوە و لەسەر دەستە یان توێژ دامەزراون. هەروەها بە خوێندنەوەی مەنتیق-یانەی کردەوەی کۆمەڵگای بازاڕیی وەکو چوارچێوەیەکی سەربەخۆ کە تێیدا هەرکەسێ بەشداری سەرمایەو کاری خۆی دەبێ، پێویستییەك نابێ، تەنیا دەبێ سەرنج بدەینە ئەم خاڵە کە زۆربەی جەماوەر لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی سەرمایەداریدا بەهۆی تایبەتمەندی و پێوەندیی نێوانیان، خاوەنی زەوی یان سەرمایەیەکی ئەوتۆو چڕوپڕ نین، هەتا لەسەری کاربکەن و لە ئاکامدا ناچارن لەسەر زەوی یان بەسەرمایەی دیتران کاربکەن. لێرەدا نامەوێ لەوەها سیستەمێکدا باسی دادوەری بکەم، چونکە لەم بابەتەوە دەتوانین بەدوو شێوە هەڵوێست بگرین. من تەنیا دەمەوێ بڵێم کە ئەگەر کۆکردنەوەی سەرەتای سەرچاوەی سەرمایە و هێزی پێکهێنانی



(سەرمایە) لە خزمەت بەشێکی بچووك لە جەماوەر دانەدەبوو ئەوکات سەرمایەداری بە بنەمای راستەقینەی خۆی نەدەگەییشت. لەراستیدا ئەوەی تۆ بەهۆیەوە سەرمایەداری هەڵدەسووڕێنێ، بڕیاری سەرمایەداران و توانایەکە کە هێزی کار وەگەڕ دەخا.

بەڵام رەنگە بگوترێ ئەگەر ئەوان نرخی هێزی کاری خەڵك بە تەواوی نەدەن (هەر بەو شێوەیەی کە لە بارودۆخی رکەبەریی بازاڕدا ناچارن هەمیشە بەم شێوەیە بجوولێنەوە) چۆن وەها گواستنەوەی هێزێك واتە گواستنەوەی هێز (هێزی کار)ی کرێکاران بۆ خاوەنانی سەرمایە، دەتوانرێ هەبێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەستە بەوەی کە ئێمە چۆن هێزی کەسێك پێناسە بکەین.

ئەگەر تواناییەکانی کەسێك تەنیا بەهێزی لەش و شارەزاییە زەینیەکانی ئەو دابنێین ئەو کات ئەگەر ئەم کەسە هێزی کاری هەڵقولاو لە تواناییە ناوبراوەکان، بەنرخی رۆژی بازاڕ، بە کەسێکی تر بفرۆشێ، هیچ چەشنە گواستنەوەیەکی راستەقینە ئەنجام نەدراوە. لەراستیدا ئەم کەسە بە ئەنجام دانی ئەم کارە ئەوشتەی کە هی خۆیەتی و بایەخی گۆڕینەوەی هەیە، دەفرۆشی و بەڕادەی دان، دەستێنێ.

بەڵام ئەگەر توانایی کەسێ تەنیا لەهێزی لەش و شارەزاییە زەینیەکانی ئەودا نەبینین، بەڵکو توانای کەڵك وەرگرتن لە هێزو پسپۆڕی لەبەرهەم هێنانیشی پێوە زیاد بکەین، ئەوکات باسەکە جیاوازی دەبێ، چونکە بەو شێوەیە هێزی ئەم کەسە نە تەنیا دەبێ هەڵگری تاقەتی ئەو بۆ کار بێ، (واتە هێزی لەش و پسپۆڕی ئەو بۆ کار) بەڵکو توانای کارکردن واتە توانای وەگەڕخستنی هێزو پسپۆڕی لەبەرهەم هێنانیش وەخۆبگرێ. من پێناسەیەکی وردترم پێ شك نایە. رەنگە هێزی ئەسپ یان ماشێن-ێك بەقەد ئەو رادەکارەی دابنێین، کە ئاژەڵ یان ماشێن دەتوانێ بیکا. جا لێرەدا ئەوە گرینگ نییە کە بەکاربێ یان نا- بەڵام ئەم شێوە ناساندنە بۆ مرۆڤ نابێ، چونکە مرۆڤ دەبێ بتوانێ هێز و پسپۆڕی خۆی لە کارگەلێك و بەرەو مەبەست گەلێك وەگەڕ بخا، کە لەوێ بە تێگەیشتووییەوە چوارچێوەی بۆ داڕشتووە. بەم پێیە

کۆی هێزی کەسێ دەبێ بێجگە لە توانایی لەش و زەین توانای وەکارخستنی ئەوانیش وەخۆبگرێ. بەواتایەکی تر ئەم مەرجە ئەوە نیشان دەدا، کە تاك دەستی بە بابەتی کارو کەرەسەی کار رابگا، جا چ زەوی بێ یان ئامرازی بەرهەمهێنان یان سەرمایە، چونکە بێ بوونی ئەوان ناتوانێ لە هێزی کاری خۆی شتێك بەرهەم بێنێ.

ئەگەر پێویست بێ هێزی کەسێك مەرجی ناوبراو-یشی هەبێ، بە ئاسانی دەستی بەکەرەسە بەرهەم هێنەرەکان ناگا و ئەگەر بەهیچ چەشنێ ئامرازە بەرهەم هێنەرەکانی لە ئیختیار دانەبێ، توانای ئەو بەڕادەی سفر دەگا و ناتوانێ درێژە بەژیان بدا. مەگەر ئەوەی بازاڕی رکەبەریی لە دەرەوە بێت و بەشێوەی بڵاوکردنەوەو دابەشکردن رزگاری بکا. ئەگەر کەسێ بتوانێ بەم شێوەیە تاڕادەیەك دەستی بە ئامرازی کار رابگا بەڵام نەتوانێ ببێتە خاوەن، ئەوکات هێزی کاری ئەو بەپێی رادەی هەوڵدان بۆ ئەم دەسکەوتە کەم دەبێتەوە. ئەمە هەل و مەرجێکە زۆربەی مرۆڤەکان تووشی هاتوون و لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕدا دیارە. بەم پێیە کەسانێ کە ئامرازی بەرهەم هێنانیان نییە بەهۆی سروشتی سیستەمی سەرمایەداری، دەبێ بەشێ لە هێزی خود بەخاوەنانی ئامرازی بەرهەمهێنان ببەخشن.

بەم شێوەیەیە کە لەنێو کۆمەڵگای سەرمایەداریدا پێوەندییەکانی نێوان جەماوەر بە پێوەندییەکانی هێز دادەنرێ، واتە بەپێی ئەو پێوەندیانە بەشێ لە جەماوەر هێزی کاری خۆیان لە ئیختیاری بەشێکی تر دادەنێن، بەم هۆیەیە کە بەدەوڵەتی لیبراڵ، کە کارە سەرەکییەکەی زمانەت کردن و پتەوترکردنی ئەم چەشنە پێوەندیانەیە، دەڵێین سیستەمی دوو چەشنی دەسەڵات. ئەگەر دەوڵەتی لیبرال ئاوایە، دەوڵەتی لیبرال دیموکراتی-ش هەر ئەم پێکهاتەیەی هەیە. چونکە هەر بەو جۆرەی بینیمان دەوڵەتی لیبرال دیموکراتی هەمان دەوڵەتی لیبراڵ-ە، کە بۆتە خاوەنی مافی دیموکراتی. زۆرجاران ئەوە لەبیر چۆتەوە کە تایبەتمەندیی گشتی کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان گواستنەوەی هێزە. ئەم راستییە شاردراوەتەوە، کە سیستەمی سەرمایەداری لە گشت پۆلین بەندییە رواڵەتییەکانی



کۆمەڵایەتیی پێش خۆی بە بڕشترەو لەچاو هەموو سیستەمەکانی تر زیاتر دەتوانێ بۆ یەکە یەکەی جەماوەری کۆمەڵگا، ستانداردی ماددی بەرز پێکبێنێ. لەبنەڕەتدا سەرمایەداری بەهۆی عادەتێکی، کە هەیەتی زیاتر لەو کۆمەڵگایە دەتوانێ بەرهەم هێنەر بێ کە بیچمی زاڵی بەرهەم هێنانەکەی کشتوکاڵ و سەپانی و بەلەدییە، چونکە لە سیستەمەکانی پێشوودا جووتیاران و بەلەدیەکان تەنیا خاوەنی کەرەسە بەرهەم هێنەرەکان بوون و بەرهەمی خۆیان دەگۆڕییەوە. لە کۆمەڵگایەکی پێکهاتوو لەبەرهەم هێنەرە تاك-ەکان، هیچ چەشنە گواستنەوەیەکی هێز ئەنجام نادرێ مەگەر ئەوەی بازاڕی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بەتەواوی رکەبەریی بێ. هیچ کەس ناتوانێ زیاتر لە دیتران قازانجی پێ بگا و سوود وەرگرێ. لە بەراورد لەگەڵ وەها سیستەمێکی سەرەتایی بازاڕدا، بە قازانج گەیشتن و زیاتر بەرهەمهێنان لە سیستەمی سەرمایەداریی دەتوانێ لەچاو هاوسەنگ کردنی گواستنەوەی هێز و توانای کارکردن خۆی زیاتر نیشان بدا، لانی کەم بۆ هەموو کەس بێجگە لە نزمترین توێژ (١/٤ کۆمەڵ) کە لە هەژاری و دەست تەنگی دان.

بەم حاڵە ئێمە چۆن دەبێ ئاوا بیربکەینەوە، کە لە ئازادترین کۆمەڵگای پشت بەستوو بەرکەبەرییدا وەها رەوتێك زۆرەملێ-یە و دادەسەپێندرێ؟ قازانج و ئاکامی ئەم لێکۆڵینەوەیە چییە، کە سیستەمی ئامادە دەکاتە دوو جەمسەری دژ بەیەك، ئەویش کاتێ هەر کام لەم دوو جەمسەرە پێویستییان بە هاوکاری و نزیکایەتی هەیە؟ بینیمان کە لە سیستەمی سەرمایەداریدا گواستنەوە یان سپاردنی هێز بۆ زۆر بەرهەمهێنان پێویستە. بەم شێوەیە بۆچی لەجیاتی ئەوەی هێزە دژەکان لێك جیابکەینەوە، ئاکام و نیشانەی کاردانەوەی هێزی ئەوان وەبەرچاو نەگرین؟ ئەگەر بە هاوتاکردنی گواستنەوەی زۆرەملێ بەرهەمهێنان و قازانج وەرگرتن لە ئاستی باڵادا بە ئاکام بگا، بۆچی ئەم هاوسەنگییەمان پێ گرینگ نەبێ و فەرامۆشی بکەین؟

ئێمە بەهۆیەکی زۆر سادە سەرنجی ئەم هاوتاییە دەدەین. هۆیەکەش ئەمەیە کە لە سەرەتادا ئەم بوارە هەرچەند نەدەڕەخسا بەڵام هەنووکە بۆ بەرهەمهێنانی زیاتر دەستەبەرکراوەو نیاز بە گواستنەوەی هێزی ئەو کەسانە ناکرێ کە هیچ سەرمایە و دەستمایەیەکیان نییە. بیرکردنەوە لەوەها سیستەمێك نە تەنیا دەکرێ، بەڵکو زۆر لە مێژەو هەنووکە لە بەشی سۆسیالیستی جیهانی سێهەمدا خەریکە بە ئاکام بگا. هەڵبەت لەم لێدوانە کارمان بەوە نییە کە لە وڵاتە ناوبراوەکاندا وەها سیستەمێك دەتوانێ بێتە سەرکار یان نا، ئێمە دەبێ دان بەو راستییەدا بنێین کە ئەم رێ هەڵبژاردنە ئێستاکە بۆتە شەپۆڵ و بۆچوونی زۆربەی وڵاتانی لە حاڵی گەشەو تازە سەربەخۆی بەرەو لای خۆی راکێشاوە. یەکێك لە فێڵە وردو ئاستەمەکانی مێژوو ئەوەیە، کە ئەگەر پێشتر هیچ سیستەمێك نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری رێکبخا و دەستی بەقازانجی چڕوپڕدا بگا، هەنووکە بەدەستی کەسانێکەوە دەکەوێتە گەڕ کە بەتەواوی لەگەڵ سەرمایەداری دژایەتی دەکەن. بەڵام مێژوو بەپێی رابوردوو ناجولێتەوەو خۆشی بە بەرپرس نازانێ.

رواڵەتی ئەم باسە تا بەئێرە ئەوە دەردەخا، کە بۆ دەربڕینی خاڵێکی سەرەکی سەبارەت بە کۆمەڵگای سەرمایەداری زیاتر لەرادەی پێویست دواین، بەڵام رەنگە پێوەندیی ئەو خاڵە لەگەڵ گرفتە هەنووکەییەکانی دیموکراسیی لیبرال تا بەئێستا دیاریکرابێ. لەو سەرەوە کە لیبرال دیموکراسیی بەرهەمی دەوڵەتی لیبرال و دەوڵەتی سەرمایەدارییە، پشتی بەگریمانەی سەلمێندراوی بازاڕی سەرمایەداری بەستووە. بەڵام دیموکراسیی لیبرال هەر ئێستاکە ناچارە لەگەڵ ئایدیالۆژیا کۆمەڵایەتییەکانی تر رکەبەریی بکا، کە زیاتر لە ئێمە ئاگاداری هێزە سەرەتایی و پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای ئێمەن. ئێمەش ئەگەر دەمانەوێ هەلی رکەبەری لە دەست نەدەین دەبێ ئاگامان لەهێزی پێکهێنەری سیستەمەکانی ئەوان بێ.

## ئەستوورەی زۆرینەخوازی و زۆرینەگەری

**(Makimization)**

دەوڵەتی دیموکراسیی لیبرال، کە لە دنیای رۆژئاوادا هاتۆتە ئاراوە، پێکهاتەیەکی مێژوویییە لە لیبرالیزم، کە لە سەرەتادا نادیموکراتیك بووەو دواتر مافی دەنگی دیموکراتی پێ زیادکراوە. بەگشتی دەوڵەتی لیبرال بریتی بوو لە حیزبە سیاسییە رکەبەرەکان، کە زامنی بەشێ لە ئازادییەکانیش بوون. ئازادیی کۆبوونەوە، ئازادیی ئاین، ئازادیی تاك و بەوتەیەکی تر پارێزران لە زیندان و بەندکران. ئەم ئازادیانە لە چەشنی خۆیاندا باش و بە پێویستییەك بۆ سیستەمی حیزبی پشت بەستوو بە رکەبەریی دادەنران. ئەرکی دەوڵەتی لیبرال ئاسان کردنەوەی پێکهێنانی بارودۆخی سەقامگیرکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداریی بازاڕی بووەو دەبێت. رکەبەری جەوهەری دەوڵەتی لیبرال و جەوهەری کۆمەڵگای بازاڕیی پێکدێنا. رکەبەرییەك لەنێوان ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك ئازادبوون. هەر جۆرێکی پێیان خۆشە لەهێز و شارەزایی خۆیان کەڵك وەردەگرن، ئازادبوون بچنەژێر دەستی ئەوکەسەی دەیانەوێ و حوکمی دەسەڵاتی دەوڵەتێك بەجێ بێنن، کە بنەمای رکەبەریی دەستەبەردەکا. دەوڵەتی لیبراڵ لە بەستێنی کۆمەڵگایەکی، کە بەدەوریدا هەڵدەسوورا، سیاسەت و مافی هەڵبژاردنی پەرەپێدەدا. وەها دەوڵەتێك هیچ پێوەندییەکی پێویستکراوی لەگەڵ دیموکراسی نەبوو. لەراستیدا هەر بەو شێوەیەی بینیمان دەوڵەتی لیبرال تا سەرەتای دەسپێکی سەدەی نۆزدە، وای دەزانی کە دیموکراسی مەترسی و هەڕەشەیە لە بوون و مانەوەی خۆی.

بەم حاڵە کاتێ وەکو بنەڕەتێکی گشتی چاو لە رکەبەریی و ئازادی هەڵبژاردن دەکرێ و دەبنە بابەت گەلێکی باش یان پڕ قازانج، هەرکەسێ دەبێ بتوانێ بێتە مەیدانی رکەبەرییەوە، ئەو باسەی کە لە دەوڵەتی لیبرالی سەرەتادا هاتە ئاراوەو داکۆکی لەسەرکرا ئەوە بوو، کە بۆچی کەسانێك مافی دەنگدانیان نییە؟ ئەم دواییەش تا ئەو شوێنە لەگەڕیان دابوو کە بە ئاکام



گەییشت. هەڵبەت نەك لەو روانگەیەوە، کە لە نێوان سیاسەتوان و مەنتیق نزیکایەتییەك هەیە، بەڵکو بەم هۆیە کە ئەوان تێگەیشتوو بوون. ئەگەر لە بەرامبەر ئەم مەنتیقەدا خۆڕاگری بکەن ناچاردەبن کە فشار و هێز بەکاربێنن. لەکاتێ کە دەوڵەتی لیبراڵ ئاوێتەی دیموکراسی دەبوو، ئەندێشەی کۆنی دیموکراسی-ش دەبووە لیبرالی. تەنانەت دەتوانین بانگەشەی ئەمە بکەین کە ئەو وڵاتانەی بەسەرکەوتووییەوە توانیان لەبیچمی لیبرالی نادیموکراتییەوە بەرەو دیموکراتی لیبرال بڕۆن، ئەوانەبوون کە پێناسەی کۆنی دیموکراسی (حکوومەتی زۆربەی هەژاران و بەقازانجی زۆربەی هەژاران)-یان کردە پێناسەی نوێ (مافی بەشداربوون لە رکەبەرییدا).

ئەندێشەی دیموکراسی هەمیشە ئەندێشەی بەرابەریی وەخۆگرتووە، هەڵبەت نەك ئەو یەکسانییە کە لە بیرکاریدا حاکمە واتە سوود = سەرمایە، بەڵکو بەرابەریی کەرەسەو بارودۆخ بۆ تێگەییشتن لە توانایی و پێوانە مرۆڤییەکان. ئەم ئەندێشەیە لە کۆمەڵگاکانی پێش لیبرالدا یان لەو کۆمەڵگایانەدا رەتدەکراوە کە زۆربەی جەماوەر لەپلەی کۆیلە یان جووتیار — کۆیلەدا دەژیان، یان لانی کەم لە نزمترین پلەی کۆمەڵایەتیدا بوون و بەهۆی ئاست و شوێنی چینایەتی نەیاندەتوانی بەتوانای تاك-ی خۆیان بگەن. مەبەستی شۆڕشە لیبرالییەکانیش سڕینەوەی ئەم بارودۆخە و دانانی پێوانە یەکسانەکان بوو بۆ تەواوی جەماوەر. ئەم مەبەستە بۆ ئەو تاقمە، کە خوازیاری کۆمەڵگای لیبرالی رکەبەریی بوون و ئەوانەی، کە زیاتر بەرابەری و هاوتاییان دەویست، بنەماگەلێکی هاوبەشی دەستەبەر دەکردو رەنگە هەر بەو هۆیەش بوو کە شۆڕشە لیبرالییەکان توانییان پێگەیەك لەنێو خەڵکدا بۆخۆیان بدۆزنەوە.

هەڵبەت بەرابەری کەرەسەو پێداویستییەکان، هەڵگری مانای جۆراوجۆرە. یەکێك لە ماناکان دەتوانێ مافی بەرابەر لە ژیانی تەواوی مرۆڤایەتی بێ بۆ گشت ئەوانەی هەڵدەسووڕێن و

زەحمەتکێشن. ئەم تێگەییشتنە بەهەمان پێناسەی کلاسیکی دیموکراسی نزیکە، کە کۆمەڵگای یەکسانیی کردبووە ئامانجی خۆی و لە لایەکی تریشەوە دەتوانێ بەو مانایە بێ کە بەشێوەی بەرابەر و هاوتا لە رکەبەرییدا بەشداری بکا، لەم روانگەیەشەوە لە چەمك و تێڕوانینی کلاسیکیی لیبرال نزیکە و کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕی دەکردە ئامانجی خۆی. روانگەی دووەم زاڵبوو و بوو بەهەوێنی سەرەکیی گشت کۆمەڵگا دیموکراتییەکانی لیبرالی هەنووکەیی. هەموو دەتوانن لە رکەبەرییدا بەشداربن و لەراستیدا هەموو دەبێ لەم رکەبەرییەدا رۆڵیان هەبێ. بەڵام هەر بەو شێوەیەی لەدوایین وتاردا دیتمان، هەموو ناتوانن بەئاستێکی بەرابەر لە مەیدانی رکەبەریی بگەن. چونکە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕ تاقمێك خاوەن سەرمایەن و تاقمێکی تر دەبێ بەم سەرمایە کاربکەن. ئەوان هیچ چەشنە سەرمایەیەکیان نییە ناچارن بۆ بەدەست هێنانی سەرمایەی کەسێکی تر، نرخی (کار)ەکەی بدەن، لەراستیدا ئەمە نرخی ئەو شتەیە، کە من پێی دەڵێم ئامرازی بەرهەم هێنان. ئەوان ناچارن بەشێ لە هێزی کاری خۆیان بەتەواوی لە خزمەت دیتران دابنێن.

بەباوەڕی من ئەم گواستنەوەیە (هێز) هەست پێناکرێ و شاراوەیە، چونکە لە ئابووریی سەرمایەدارییدا بەرهەمهێنان و قازانجی زۆر ئەو (گواستنەوەیە) وەخۆدەگرێ و دەیشارێتەوە. تەنیا کاتێ، کە دابەزین یان قەیرانی ئابووری بەدی بکرێ، دروست وەکو قەیرانی دەیەی ١٩٣٠، گواستنەوەی هێز ئاشکرا دەبێ. ئەوکات روون دەبێتەوە، کە وەها گواستنەوەیەك لەسەر کەسانێ، کە تەنیا هێزی کار لە خۆیان شك دەبەن و ئەوانەی سەرمایەی کەمیان هەیە چ شوێنەوارێ دادەنێ. لەم حاڵەتەدا گرووپە سەربەخۆکانی جووتیاران تێدەگەن، کە ئەگەر سەرمایەی لەحاڵی گەڕیانی ئەوان بە قەرز بێ ناتوانن بۆماوەیەکی درێژخایەن سەربەخۆبن.



دەرەنجام ئەوەیە کە هەم کرێکاران و هەم جووتیاران روودەکەنە کاری سیاسی و هەوڵ دەدەن بۆئەوەی گواستنەوەی هێز کەم بکەنەوەو جاری وایە کاری سیاسی تا ئەو شوێنە بەرەو کەمبوونەوەی گواستنەوەی هێز دەڕوا: کە لانی کەم دەوڵەت ناچار دەکا دراوەکان بەرەو شوێنەکانی تر رەوانە بکەن و لە گوشاری قەیران کەم بکرێتەوە. بیمەی کۆمەڵایەتی و باقی خزمەتگوزارییەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەران تا کاتێ وێنەیەکن لەم وەرسوڕانانە، کە لە ماڵیاتە وەرگیراوەکانەوە دەدرێن.

دەوڵەتی خۆشگوزەران بەئاشکرایی خەریکە خۆدەگرێ. هەنووکە لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا دەوڵەتی خۆشگوزەران کە بەپێکهاتەی سیاسیی لیبرال دیموکراتی ئیدارە دەکرێ، گونجاوەو بەباش دادەنرێ. بەڵام نابێ لەبیرمان بچێ، کە ئاڵوگۆڕکردن و گواستنەوەی هاوسەنگ و کاریگەر، کە رێچارەیەکی سیاسییە، لەنێو دەوڵەتە لیبرالەکاندا هیچ کات ناتوانێ بەشێوەیەکی بنەڕەتی و هەمەلایەنە و هاوتا گواستنەوەی هێز بسڕێتەوە. دەستڕۆیشتووترین لایەنگرانی سەرمایەداری بەباشی لەم لایەنە حاڵی دەبن، هەڵبەت بەم روانگە رەوایەوە، کە گواستنەوەی خۆشگوزەران تا ئەو رادەیە بەرفراوان و گەورە ببنەوە، کە گشت قازانج و دراوە ئابوورییەکان وەخۆبگرن، دامەزراوە سەرمایەدارییەکان هیچ هیوایەکیان بۆ درێژەدان بەهەڵسووڕان نابێ و ئیتر دامەزراوەیەکی سەرمایەداری بەدی ناکرێ. تا کاتێ، کە لە لایەنە باشەکانی سیستەمی سەرمایەداری قازانج وەردەگرین، ناچارین گواستنەوەی زۆرەملێ-ی هێزی رەشایی بۆ خاوەن ملکان قبووڵ بکەین. خۆڕاگرتن لەژێر ئەم کارەسانایە، چونکە لەراستییدا ئەم کارە تا کاتێ سەرمایەداری خەریکی بەرهەمهێنانی خۆیەتی، گوشار ناخاتە سەر ئێمە و ئێمە هەستی پێ ناکەین.

زۆربەی بیرمەندان و زانایان، کە رەنگدانەوەی کۆمەڵگای خۆیانن، رەنگە بیچمی گشتیی پەیکەرەی بابەتە ناوبراوەکان بەنامۆ و بێ قازانج بزانن. کەسانی پسپۆڕ، کە لە رێکخراوە

گشتی یان نیوە گشتییەکاندا کاردەکەن و پێیان وانییە کە مەبەست لە هەڵسووڕان وەچنگ هێنانی قازانج و سوود-ە، ناتوانن گواستنەوەی بەشێك لەهێزی خۆیان بۆ خاوەنانی سەرمایەیەك بناسن کە لەسەری کار دەکەن. مامۆستایان و کارمەندانی کۆمەڵایەتی، بەرپرسانی کتێبخانە و کارمەندە دەوڵەتییەکان بەشێوەی راستەوخۆ و ئاشکرا هێزی خۆیان ناگوێزنەوە، ئێستا ئایا دەبێ پەیکەری کۆمەڵگای خۆمان بەپێی ژمارەیەکی زۆر لەم خەڵکانە بنیاتبنێینەوە؟ پێم وایە کە نا، چونکە رادەی پاداشت کە ئەم چەشنە خەڵکانە لە بەراوردکاریی خۆیاندا وەریدەگرن، بەپێی رادەی ئەو پاداشتەیە، کە جەماوەری هاوپلەی ئەوان لە بەشی قازانجدەری ئابووری وەریدەگرن. ئەم بارودۆخە بەم هۆیەیە کە پسپۆڕی و شارەزایی ئەم دوو دەستەیە چ لێك بچن یان نەچن، دەتوانن لەهەر دوو بەشی قازانجدەر یان بێ قازانجدا هەڵسەنگێندرێن. بەشێك لە کارە پسپۆڕییەکان دەتوانن لەنێوان دووبەرەی ئابووریدا کەسێك هەڵسووڕێنن، بەڵام حەقدەستەکان لە بەشی بێ قازانجدا زیاتر لە بەشی قازانجدەر نییە، ئەگینا ئەگەر وابوایە هەمووکەس بۆ کارکردن روو دەکاتە بەشی بێ قازانج. بەم پێیە لە ئابووریی بازاڕی ئازاددا، نرخی حەقدەست و پاداشت بەپێی شارەزاییەکان و ماوەی فێرکاریی نابێ و ناتوانێ لەدووبەشی قازانجدەر و بێ قازانجدا جیاوازی هەبێ. بەڵام لەبەشی قازانجدەردا رادەی پاداشت و حەقدەست بەشێوەیەکە، کە بارودۆخی گواستنەوەی هێزی کار بۆ خاوەنانی ئامرازی بەرهەمهێنان دەستەبەر دەکا. بەم شێوەیە لە بەشی بێ قازانجدا، ئەم هێزەی، کە دەگوازرێتەوە بەکێ دەدرێ؟ وەڵام ئەوەیە کە بەگشت خەڵك یان تەواوی جەماوەر دەدرێ، لە خۆجێییەوە تا دەگاتە نەتەوەیی، کە بەهۆی نووسینگە جۆراوجۆرەکانەوە دەستەبەرکراون.

پێناچێت گواستنەوەی هێزی تاك بەرەو ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژی راست و کامڵ بێ، چونکە تاك لە ئاکامدا وەکو ئەندامێکی ئەو کۆمەڵگایە بەهێز و دەسەڵات دەگا و (لە کۆمەڵگای) وەردەگرێتەوە. بەڵام سەرلەبەری ئەم هێزە نابینێتەوە. بەشێك لەم هێزە هی



ئەندامێکە، کە هێزی خۆیان بۆ شەریکایەتی داناوەو هەروەها بەخاوەنانی ئامرازە بەرهەم هێنەرەکانیشی دەسپێرن. بەم پێیە بەشێك لەهێزی تاك لە تاك دەستێندرێتەوە. ئەم کارە تا کاتێ حاشا هەڵنەگرە، کە سیستەمی سەرمایەداری بۆ پاراستن و سەقامگیرکردنی کار و بەرهەمهێنان، کە بە قازانجی گشت کۆمەڵگا بێ، بەکاربێنن.

بەم شێوەیە دیسان بەم دەرەنجامە دەگەین، کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕ، گواستنەوەی کامڵی بەشێ لە هێزی تاك بۆ دیتران یان کۆمەڵگا، پێویستە و حاشای لێناکرێ. سیاسەتی هەڵبژاردن و کۆمەڵگای سەر لەبەر رکەبەرایەتی، هەمیشە بۆ گواستنەوەی زۆرەملێی هێز ئامادەیە و دەیکاتە بابەتی. ئەم گواستنەوە زۆرەملێ-یە، لەراستیدا جەوهەری مرۆڤایەتی وەبەرچاوناگرێ. ئەم راستییە کە گواستنەوەی هێز تەنیا لەسەردەمی دابەزینی بەرهەمهێنان، یان لە وڵاتە کەم داهات و هەژارەکاندا هەست پێدەکرێ، بەم مانایە نییە، کە گواستنەوەی هەمیشەیی بەشێکە لە پێکهاتەی سیستەمەکە. هەڵبەت تا کاتێ روانگە یان دیدێکی جێگرتوو. ئەم بابەتە زۆر گرینگ نییە، بەبێ گواستنەوەی هێز هیچ رێیەك بۆ وەچنگهێنانی زۆر بەرهەمهێنان بەدی ناکرێ. لەراستیدا مەنتیقی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەمەحەك دراوەو بۆ مشتومڕ خواستراوە. وەڵامی ئێمە تا چ رادەیەك رازیمان دەکا یان دڵنیاییمان پێدەبەخشێ؟

ماوەیەکی دوورودرێژ — ماوەی سەدەیەك —ە کە ناسراوترین بیرمەندە لیبراڵەکان بەوە گەییشتوون، کە نیازییان بە وەڵام هەیە. من بیر لەو لیبراڵە مەزنە واتە ((جان ستیوارت میل)) دەکەمەوە، کە ماوەی زیاتر لە سەدەیەك لەمەو پێش بەوەی زانیبوو، کە چینی کرێکار زیاتر لەوە ناتوانێ گواستنەوەی هێز قبووڵ بکا. هەڵبەت ئەو بۆخۆی بە وەڵامێکی شیاو نەگەییشت. دۆزینەوەی رێگایەك بۆ ئەم کێشەیە، بۆ بەرەیەك لە ئابووریناسانی ساڵەکانی ١٨٧٠و دوای ئەوانیش بەجێما، هەتا وەڵامێ بدۆزنەوە، کە بتوانێ وەڵامدەری



PDF 4 KURD

لایەنگری و نیازەکانی داهاتوو بێ (دەبێ بڵێین کە زۆربەی ئابووریناسان هەنووکە دەزانن، کە ئەمە وەڵامێك نییە بەڵکو لە ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگا لیبرالییەکاندا بەوەڵام دادەنرێ).

ئەو وەڵامەی لە لایەن ئەوانەوە هاتە ئاراوە، لە تیۆرێکی پێشووی تاکخواز سەرچاوەی گرتبوو، کە بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەو دۆخێك، کە ئەندێشەی مافە سروشتییەکان سەرنجێکی نوێی بەرەو خود نیشاندا. ئەم ئەندێشە سوننەتییە، کە بەقەد چاخی ئەرەستۆ کۆنە دەڵێ؛ کە عادەت و جەوهەری مرۆڤ بەرەو مەبەستێکی عاقڵانە و ئاگادارانە هەڵدەسووڕێ. باوەڕی نوێ ئەوەیە، کە جەوهەری کاری عاقڵانە بریتیە لە بەوپەڕ گەیاندنی چێژ و ئەرخەیان بوونی تاك، زۆرکردنی قازانج و بەهرەی تاك. بەم پێیە عادەت و جەوهەری مرۆڤ پێکهاتەی کارێکی عاقڵانەیە، کە قازانج و چێژی مرۆڤ بەوپەڕی خۆی دەگەیەنێ.

هەتا سەدەی نۆزدەهەم، قوتابخانەی سوودگەرایی ئەندێشە، باوبووەو بەپێی ئەم قوتابخانەیە زۆرینەسازیی سوود، دوایین قازانج و بەرژەوەندیی مرۆڤە. لە روانگەی ئەم فەلسەفەیەوە خواستی مرۆڤ بۆ چێژ و بەرژەوەندییەکان بێ کۆتاییە و بەم هۆیە مرۆڤەکان تا ئەوجێیەی دەتوانن (هەمیشە دەتوانن)، وە دوای ئەم ئەرخەیانی یان قازانجە دەکەون و بەوپەڕی خۆی دەگەیەنن. لەبەرئەوەی ئاواتەکانی مرۆڤ بێ کۆتاییە، ئەو کەرەسانەی مرۆڤ رازی دەکەن دەبێ هەمیشە نایاب بن. بەم شێوەیە دەبێ سیستەمێك بەدی بێنین، کە بتوانێ ئامرازە نایابەکان وەدەست بگرێ و بەرژەوەندی و قازانجەکان بەوپەڕی خۆی بگەیەنێ. چارەی ئەم مەسەلەیە هێنانە ئارای بیچمی بازاڕی رکەبەرایەتی ئازاد بوو لەژێرباڵی دەوڵەتی لیبرالّدا. لەو کاتەوە تا بەهەنووکە تیۆری سەلمێنەری دیموکراسیی لیبرال لەسەربنەمای ئەم ئەندێشەیەیە، واتە تیۆری بەوپەڕگەیاندنی قازانج-یان سوود راوەستاوە.

لە یەکەم روانگەدا زۆرینەسازی، دروست و بێ کەموکوڕی دێتە بەرچاو، ئێمە وای دادەنێین کە هەرکەسێ سەرچاوەیەك لەسەرمایە و زەوی لە ئیختیاردایە، لێرەدا ئابووریناسە



سیاسییەکان دەیانتوانی ئەمە نیشانبدەن، کە کەسێ دەتوانێ زۆربەرهەم بێنێ، کە لە بازاڕی ئازادی رکەبەرایەتیدا زیاترین هەڵسووڕانی هەیە. بەم شێوەیە نە تەنیا کاڵا بەزۆرینەیی بەرهەم هاتن دەگا، بەڵکو دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی کەلوپەل-یش بەپێی ئەو بەشەی، کە تاك لە بەرهەم هێناندا هەیەتی، دەبێتە هی هەموو کەس. ئەم مەنتیقە تەواو کاملّ و بێ کەموکوڕ پێناسەکرا.

هەڵبەت هەرچەند تیۆری سەلمێنەری کۆمەڵگای دیموکراسیی لیبرال هێشتا لەسەر تیۆری زۆرینەسازیی بەرژەوەند راوەستاوە، بەڵام بە چەند هۆ تاڕادەیەك تیۆرێکی سەلمێنەرانەیە کە کەس ئەرخەیان ناکا؟

لە پلەی یەکەمدا کاتێ قازانجەکان رەنگدانەوەی بازاڕێکی تەواو رکەبەرایەتی بن زۆرینەسازیی بەرژەوەندییەکان دروست دەبێ. بە فەرزکردنی بەشێ لە سەرچاوە و قازانجەکان ئەوەنیشان دەدرێ، کە کردەوەی بازاڕی ئازاد کاردانەوەی سوودی ئەوکەسانەی کە کاردەکەن، بەوپەڕی خۆی دەگەیەنێ. بەڵام ئێوە ناتوانن ئەم سیستەمە بسەلمێنن، مەگەر ئەوەی بتوانن نیشان بدەن کە ئەم چەشنە دابەشکردنە (سوودو سەرمایە) عادڵانەیە.

هەروەها ئەم شێوەیە، بۆ نیشاندانی ئەوەی کە لە بازاڕێکی تەواو رکەبەرایەتیدا تاك دروست بەپێی کاردانەوەی سەرمایە یان هێزی خۆیان بە قازانج دەگەن، شێوەیەکی دروست و گونجاو نییە، چونکە بۆئەوەی سەلماندنێکی ئەخلاقی-مان بۆ ئەم سیستەمە هەبێ دەبێ بتوانن بیسەلمێنین، کە پاداشت بەپێی ئەو هۆکارانەی لە بەرهەمهێناندا بەشدارن بەراوردبکرێن، وەکو سەرمایەی کەڵەکەبوو (زۆربوونی سەرمایە)و سەرچاوە سروشتییەکان، کە خاوەنەکانیان ئاراستەی دەکەن. بە دژواری دەتوانین نیشانی بدەین کە ئەم هۆکارە ناوبراوانە بەڕادەی هێز و شارەزایی جەماوەری، دابەش دەکرێن.

بەم پێیە تەنانەت بە فەرزکردنی رکەبەرایەتیی تەواو بەهیچ شێوەیەکی گونجاو ناتوانین سیستەمەکە بسەلمێنین. بەڵام لەبارەی ئەم بابەتەوە دەبێ بگوترێ کە گەشەی سروشتیی بازاڕی سەرمایەداری لەوشتەی کە لە تیۆرەکەدا چاوەڕوانی دەکرا واتە رکەبەرایەتیی دروست و تەواو، چەواشەو دوور بووە. ئەم هۆیە کە بەرهەمهێنانی کاڵا سەرەکییەوەکان بەهۆی کردەوەی سروشتیی بازاڕ بەوپەڕی خۆی دەگا، پێویستی هەیە بەبوون یان فەرزی هەبوونی بازاڕێکی تەواو رکەبەرایەتی کە تێیدا هیچ کەس یان دەستەیەك لە جەماوەر نەتوانن نرخەکان بخەنەژێر چاودێری خۆیانەوە. تەنیا کاتێ کە نووسینگە ناچاربێ بەپێی بازاڕ بەهرە وەرگرێ و بەپێی بازاڕ نرخی پێداویستییەکان و هەروەها نرخی ئەو شتە دەستنیشان بکا کە لەلایان ئەوەوە بۆ فرۆش بەرهەم هاتووە. سیستەمی نووسینگە ئابوورییەکان شتێك بەرهەم دێنن کە بەشێوەی بەرچاو پێویستە. تەنیا بەمجۆرە کە لەلایەن بەڕێوەبەرانی بازاڕەوە ئامرازەکان و ئەو کەرەسانەی بەکەمی وەدەست دەکەون و لە ئیختیاری کۆمەڵدان هەر لەخۆوە بەرەو خزمەتگوزاری و کاڵا باشەکان هان دەدرێن. بەواتایەکی تر تەنیا بەم جۆرە بازاڕ دەتوانێ کەرەسە خزمەتگوزارییەکان بەوپەڕی خۆی بگەیەنێ.

بەڵام ماوەیەکی دوورودرێژە کە ئابووریی وڵاتە پێشکەوتووەکانی سەرمایەدارییەکان بە قۆناغێ گەیشتووە کە دامەزراوە ئابوورییە گەورەکان یان گرووپ گەلێ لەم دامەزراوانە بۆخۆیان دەتوانن کاردانەوەو نرخی زۆربەی کاڵاکان کۆنترۆڵ بکەن. تا کاتێ ئەوان توانای نرخ دانانیان هەیە، بۆچوون و ویستەکانی ئەوان لە بابەت بەرهەم هێنانەوە بەپێی بازاڕ نابێ و ناتوانین چاوەڕوانیمان بێ کە بانگەشە و ویستەکانی ئەوان بە قازانج گشت کۆمەڵگاو لەرێی زۆرینەسازیی خزمەتگوزاری و کەرەسە خزمەتگوزارییەکان دابێ.

باشی و گونجاویی بازاڕی سەر لەبەر رکەبەرایەتی ئەوەیە کە تەواوی جەماوەر و ئەو شەریکانەی لەوەها بازاڕێکدا هەن و وای دانێین بەرەو زۆرینەسازیی قازانجی تاکی دەڕۆن،



تەنیا بەزۆرینەسازی لەرێی بەرژەوەندیی کۆمەڵگاوە دەتوانن ئەم قازانجە وەچنگ بێنن. لە سیستەمی بازاڕدا یاسای نەگۆڕ ئەوەیە کە هەر کەسێ هەوڵ دەدا بەزیاترین بەهرە بگا. بەڵام وەها کردەوەیەك تەنیا لە بازاڕی رکەبەرییدایە کە زۆرینەسازیی بەهرەو خۆشگوزەرانی بە قازانجی گشت کۆمەڵگا دەبێ. بەڵام لە شوێنێك کە رکەبەرایەتی سانسۆڕ دەکرێ کۆمپانیا و دامەزراوە ئابوورییەکان دەست دەکەن بە زۆرینەکردنی سوودی تایبەتی و قازانجەکان و ئەم رەوتە هیچ کات بە گشتگیربوونی کەرەسە ئاسوودەییەکانی کۆمەڵگا بەرتەسك ناکرێ.

بەڵام ئەگەر رکەبەرایەتیی کاریگەر، باش و گونجاو بێ یان بەبارودۆخێك بۆ سڕینەوە یان کەمکردنەوەی رکەبەریی دابنێین و رێگا بۆ ئەو دامەزاوانە دابنێین کە نرخ دادەنێن بەوە دەگەین کە ئەم گریمانەیە یانی بازاڕ بوارەکانی ئاسوودەیی کۆمەڵگا بەرفراوان دەکا، ناتوانێ بەشێوەیەکی باش مەسەلەی باس لێکراو بسەڵمێنێ، یانی ئەگەر ئەم تیۆرە سەلمێنەر و نیشاندەری ئابووری بازاڕە، دەبێ سەرنج بەو شتە بدرێ کە پێویستە بسەلمێندرێ. ئەم تیۆرە دەبێ قبووڵی بکا کە بەشێکی دیاریکراو لە دابەشکردنی دراوەکان دەسەلمێندرێ و بازاڕ بەپێی وێنەی مافی تاك خەریکی دابەشکردنی پاداشتەکان دەبێ.

بەباوەڕی من هەنووکە ئێمە دەتوانین کێشەکانی تر کەبەدەوری زۆرینەسازیی پێداویستییە ئاسوودەییەکان-ەوەن وەبەرچاوبگرین، بەڵام لە درێژەی ئەم وتارەدا باسی لێدەکەین کە چۆن دەتوانین ئەو بەرژەوەندیانەی کە خەڵکی جۆراوجۆر وەدەستی دێنن لە پەنای یەکتر دابنێین؟ چۆن دەتوانین پێوانەکانی ئەوان کە جیاوازن پێکەوە بەراورد بکەین یان هەڵیان سەنگێنین؟

لانی کەم دەتوانرێ بگوترێ کە هیچ رێیەك بۆ ئەم بەراوردکردنە بەدی ناکرێ. بەڵام کاتێ وەها رێیەك نەبێ ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە کۆ یان تێکەڵاوییەك لەبەرژەوەندی رەگەکانی رازیبوون بە زۆرینە گەیشتوون و ناتوانرێ داوابکرێ کە دەستەیەك لە کەرەسە



PDF 4 KURD

ئاسوودەییەکان بۆ گشت کۆمەڵگا کە هەڵگری پاژەکانی X و Yو....ن مانای کۆیەك لە پێداویستییە ئاسوودەییەکان وەخۆدەگرن.

تەنیا رێی خۆبواردن لەم کێشەیە، کە دەگوترێ، هەر کۆمەڵگایەك تارادەیەك لە روانگەی بایەخی مرۆڤایەتی سەبارەت بە کەلوپەلە جیاوازەکانەوە، چەشنێ هەڵسەنگاندنی رادیکاڵ و ئەخلاقی ئەنجام دەدەن و بەپێی ئەم هەڵسەنگاندنە باشترین کەرەسە و کاڵا ئاسوودەیی بۆ خەڵك و منداڵانی خۆیان، دەستەبەر دەکا.

بەڵام ئەگەر وەها پێوانەیەك بە گونجاو دابنێین گشت کارو هەڵسوکەوتەکان بە بازاڕ دەسپێردرێن و ئیتر ناتوانین بانگەشەی ئەمە بکەین، کە بازاڕ ویستە خۆڕسکەکانی هەر کام لەجەماوەر بەجێدێنێ.

هەڵبەت پێویست نییە زیاتر لەرادەی پێویست سەرنجی دژواریە بابەتی و مەنتیقییەکانی ئەم تیۆرە (کە بازاڕ خزمەتگوزاری و کەرەسە ئاسوودەییەکان بۆ گشت کۆمەڵگا بەوپەڕی خۆی دەگەیەنێ) بدەین.

ئێمە دەتوانین ئەم مەسەلانە وەبەرچاونەگرین، چونکە سەبارەت بەم بابەتەی کە باسی لێکرا ئەم بۆچوونانە زۆر پێویست نین. لەم بوارەدا دژوارییە بەرچاوەکان هەر ئەوانەن، کە لە سەرەتای باسەکەماندا ئاماژەیان پێکرا، واتە، (١) تەنیا کاتێ دەتوانین بیسەلمێنین کە بازاڕ ئاسوودەیی کۆمەڵگا بەوپەڕی خۆی دەگەیەنێ، کەرادەیەکی دیاریکراو لە دابەشکردنی سوود ببێ، بازاڕ تەنیا ئەو دەستە لە خەڵك رازی دەکا کە توانای کڕینیان هەیە.[٢] بازاڕ ناتوانێ تەنیا بەپێی توانایی و پسپۆڕی خەڵکی پاداشت بدا، بەڵکو دەبێ مولکایەتیش وەبەرچاوبگرێ و بەشێکی-شی بۆ دیاری بکا. بازاڕ دەبێ چاودێری گواستنەوەی هێزبێ.

پێم وایە زیاتر لەرادەی پێویست باسی تیۆری زۆرینەسازیمان کردووە، بە چەشنێ کە ئیتر بەئاسانی دەتوانین پێی بڵێین ئەفسانە و ئەستوورەی زۆرینەسازی. دەبێ بپرسین کە ئەم تیۆرە لە بابەت روانگەی داهاتی دیموکراسیی لیبراڵ-ەوە، کە کێشەی سەرەکی وتارەکانی ئەم



کتێبەیە، چ رێگایەکمان بۆ دەدۆزێتەوە؟ بە بۆچوونی من رێگای زۆر، چونکە وێدەچێ دیموکراسیی لیبراڵی رۆژئاوا زیاتر لە جاران پشتی بەم تیۆرە بەستبێ و هەڵسوکەوتی ئایدیۆلۆژیای ٢/٣ی دیکەی جیهانی دەوێ، کە ئەخلاقە رکەبەرییەکانی رەتکردۆتەوە، هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە، کە تێبگەین تیۆری زۆرینەسازی بۆ ئەم چەشنە رکەبەرایەتییە، کە ئێمە لەهەرێمی داین، باش و گونجاونییە و دەبێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو مانەوە بەم رێگایە ببەخشین.

من دەمەوێ بڵێم، کە تیۆری سیاسی و ئەخلاقی ئێمە کاتێ دەستی بەراڤەی جەوهەری مرۆڤایەتی کرد، وەکو مولکایەتی و وەچنگهێنانی بەهرە، تووشی وەرسووڕانێك هات، کە هەڵەبوو.

پێشتر لەم وتارەدا گوتم؛ پێش سەرهەڵدانی کۆمەڵگای پشت بەستوو بەبازاڕ، روانگەی سووننەتی ئەمەبوو، کە جەوهەری مرۆڤ لەگەڕان بەدوای مەبەستێکی عاقڵانە، ژیرانە دەکەوێتە گەڕیان. دواتر بەسەرهەڵدانی کۆمەڵگای بازاڕی، ئەم عادەتەیان بەگەڕان بەدوای زۆرینەسازیی سوود و سەرمایەی ماددی دانا. ئەم دەرەنجامە لەو کاتەدا واقعخواز بوو، چونکە بەسەرهەڵدانی بازاڕ مولکایەتی بوو بە تەنیا کەرەسەی کاریگەر بۆ بە ئاکام گەیشتنی تاك. گریمانەی لیبرالیی مرۆڤ و کۆمەڵگا کە لە حاڵی گەشەو پێشکەوتن دابوو بۆ ناساندن و سەلماندنی کۆمەڵگای بازاڕی هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەم مولکایەتییە پێ داگرت.

بەم حاڵە تیۆری ناوبراو وەکو گریمانەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر چەند لایەنێکی پۆزەتیڤانەی هەبوو، چونکە ئەگەر عادەتی مرۆڤ بەوەچنگهێنانی ((زیاتر)) بناسێنین و ویست و چۆنیەتی بوونی مرۆڤ نەك لە هەڵسووڕانی داهێنەرانەدا، بەڵکو لەچاوچنۆکیی بۆ مولکایەتیدا دەبینین، تووشی دژواریەکی چارە نەبوو دێین.

جەماوەری مرۆڤایەتی لەروانگەی هێزی لەش و شاز-ی زەینەوە لە یەك ناچن، بەشێوەیەك کە ئەگەر ئەوان بخەینە بارودۆخێکەوە، کە تێیدا بۆ ملکایەتی، کێبڕکێ و رکەبەرایەتیی

بەردەوام بکەن، دەبینین کە بەشێك لەم جەماوەرە نەتەنیا زیاتر لەدیتران سوودیان پێدەگا، بەڵکو پێیان وایە کە تەنیا دەبێ خودی ئەوان ئامرازی بەرهەمهێنان بخەنە ژێر چاودێرییەوە. بەم پێیە دیتران ناتوانن بەتەواوی درێژە بەبوونی مرۆڤایەتیی خۆیان بدەن، تەنانەت لەمانای بەرتەسکی وشەدا (لە روانگەی سەرمایە و بەماڵ و سامان گەیشتن)، چ بگا بەوەی کە بتوانن لە هەڵسووڕانی داهێنەرانە و خاوەن مەبەستدا گەشە بەتواناییەکانی خۆیان بدەن.

بەم پێیە لە پێناسەی عادەتی مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك بەدوای موڵکایەتیدا ناکرێ زۆربەی جەماوەر بتوانن بەسەرجەم رەهەندە مرۆڤایەتییەکان بگەن. ئەگەر مرۆڤ بە بوونەوەرێکی داگیرکەر و دەستدرێژکار بناسێنین، قەت ناتوانین زۆربەی جەماوەر بخەینە پێوانەی پێناسەی ((مرۆڤ))-ەوە.

رەنگە بڵێین هیچ هەڵبژاردن یان لایەنێکی تر نییە. رەنگە بڵێین مرۆڤەکان لە راستیدا ویست و ئێستای بێ بڕانەوەیان هەیە و بەهەر شێوەیەك کە ئیزنیان پێدراوە هەوڵ دەدەن زیاتر لەوەی کە هەیانە داگیربکەن. بەم پێیە کاتێ تێبگەین کە مرۆڤەکان لە روانگەی هێزو شارەزاییەوە یەکسان نین لایەنێکی ترمان نییە، بەڵام بەم حاڵە ناچارین لەگەڵ ئەم راستییە کە تاقمێك زیاتر وەچنگ دێنن، رێك بکەوین. بەم شێوەیە رەنگە بڵێین و وای دانێین، کە بەشێ لە مرۆڤەکان لەپێوانەی مرۆڤایەتیدا ناگونجێن. ئەگەر لە مرۆڤەکان بگەڕێین هەتا ئازادانە وەچنگ بێنن و داگیربکەن لەباری ئینسانییەوە دەبێ بەشێکی بەرین لە مرۆڤەکان رەتبکرێنەوە، بەڵام ئەگەر نەمانەوێ رەتیان بکەینەوە ناچارین شتێکی تر وەلابنێین. ئێمە ناچارین بەهۆی دیاردەی موڵکایەتی، ئازادی مرۆڤ لە هەڵسووڕان بۆ بەجێهێنانی ئاواتە بێ پایان و سروشتییەکانی خۆیان، رەت بکەینەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا رەتکردنەوەی مرۆڤە. لەرواڵەتدا ناتوانین لە هیچ کام لە دژایەتییەکان دەربازبین. لەهەر حاڵەتێکدا قبووڵکردنی سەر لەبەری مرۆڤایەتی بریتییە لە رەتکردنەوەی مرۆڤایەتی. وێدەچی کە کۆمەڵگاکانی پێشوو، ئەوانەی بیچمی سەرەتای کۆمەڵگای بازاڕی بوون، تووشی ئەم دوولایەنە دژە هاتبن، چونکە ئەوان بەشێوەیەکی بەربڵاو ئازادییان رەتکردۆتەوە، تەنانەت لەکردەوەشدا رێزیان لەبەرابەری نەگرتووە.



بەم حاڵە رەنگە ئەم راستییە واتە بوونی دوولایەنی و دژواری، دیاردەیەکی بێ وێنە بێ و کۆمەڵگای لێوڕێژ و خۆشگوزەرانی هەنووکەیی، منەتباری دەسکەوت و پێشکەوتوویی و تەکنیکی دامەزراوە سەرمایەدارییەکان بێ. دژواری بەرچاو ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو شتانەی پێوەندییان بە ئاواتە بێ بڕانەوەکانەوە هەیە وەچنگ ناکەون، تاڕادەیەکی زۆر کۆمەڵگای بازاڕیی خولڤاندوویەتی و هەنووکە پێشکەوتن بۆ بەرهەمهێنانی کەلوپەل و پێداویستییەکان، کە دیاریی سیستەمی بازاڕی سەرمایەداری بووە، گریمانەی Scarcity بێ باوەڕ و بێ بەقا دەکا.

لەدوایین وتاردا باسی ئەوە دەکەین، کە ئایا روانگەی کۆمەڵگای خوشگوزەران کە خەریکە جێگای ئابووریی دانراو لەسەرScarcity دەگرێتەوە، بوار بە کۆمەڵگای لیبراڵ دیموکراتی ئێمە دەدا، هەتا بەسەر دژایەتی ناوبراودا زاڵ بێ کە تا بەهەنووکە بەشێوەی خودی فەرزکراوە.

پرسیار ئەوەیە، کە چۆن دەتوانین کۆمەڵگایەك بسڕینەوە کە مرۆڤایەتیی ئێمەی لە قاڵبی موڵکایەتیدا پێناسە کردووەو لەناوی دەبا و بەکۆمەڵگایەك بگەین، کە بەپێی هەڵسووڕانی داهێنەرانە مرۆڤ دەناسێنێ؟

# داهاتووی نزیکی دیموکراسی و مافی مرۆڤ

له یەکەم وتاری ئەم کۆیەدا دەستەیەك لەو مەسەلانەم هێناوەتە ئاراوە. کە سەبارەت بەداهاتی دیموکراسییەوە بوون. لە پێنج وتاری پێشتردا باسی ئەو هۆکارانەم کردووە کە بەشێوەی گشتی بەدەوری تەوەری ئاستی دیموکراسیدا دەسوورانەوەو بەشێ لە لایەنەکانی ئەم هۆکارانەم شی کردەوە. هەنووکە دەتوانین سەرنج بدەینە ئەم بابەتە کە دەرەنجام و لێکۆڵینەوەکانی ئێمە تا چ رادەیەك توانیویانە لە دەست نیشانکردن و جیاکردنەوەی گرێ سەرەکییەکان و یاسامەندکردنی دیاردە هەنووکەییەکان یاریدەی ئێمە بدەن؟

مەسەلە سەرەکییەکان لە ناسینی رەهەندە نوێیەکانی دیموکراسی سەرچاوەیان گرتووە یان بەواتایەکی تر ئاوێتەبوونی لایەنی نوێ و کۆنی (دیموکراسی)یە. رەهەندی نوێ ئەوەبوو کە دیموکراسییە رۆژئاواییەکان ئیتر ناتوانن خوازیاری رێبەرایەتی یان تایبەتکردنی رێبەرایەتی جیهان بن، چونکە هەر ئێستاکە لە جیهاندا دوو چەمکی تر لە دیموکراسی هاتوونەتە ئاراوە، کە لە کەنار دیموکراسیی رۆژئاوایی درێژە بەژیانی خۆیان دەدەن؛ یەکیان ئەو دیموکراسییە باوەیە کە لەبەرەی یەکێتی سۆڤیەت دایە و ئەویتریان دیموکراسیی زاڵە کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمدا و بەتایبەت لەوڵاتانی تازە سەربەخۆ خۆیدا سەپاندووە. لە کردەوەدا هەردوو چەشنی دیموکراسیی ناوبراو لەنێو سیستەمە سیاسییەکانی هەڵسووڕاودا نیشان دراون و بەدیدەکرێن هەروەها هەردووکیان نالیبرال-ن.

رەهەندی نوێی دیموکراسی لەسەر بناغەی راستەقینەیەکی کۆندا راوەستاوەو زۆربەی خەڵك لەژێر باڵی دیموکراسیی لیبرالدا بۆ تایبەتمەندیی بێ وێنەی دەسەڵاتی لیبراڵ دیموکراتی بایەخی زۆر دادەنێن. ئەوشتەی زیاتر لە هەموو شتێکی تر بایەخی بۆ دادەنرێ ئازادییە شارستانییەکانە، کە دەوڵەتی لیبرال دیموکراتی زمنیانە: ئازادیی بیرورا، ئازادیی کۆبوونەوە،



ئازادیی پارێزران لە بەرامبەر کۆت و زنجیرو زیندان. سەرەڕای ئەوەش ئێمەی رۆژئاوایی بایەخ بۆ ئەو شێوانە دادەنێین، کە دەوڵەت و حکوومەت بۆ بریسکانەوەی ئیرادەی زۆرینە بەکاری دێنن. بەگشتی ئەم شێوانە بریتین لە رکەبەرایەتی حیزبە سیاسییەکان، ئەو حیزبانەی کە خەڵکی دەتوانن بەشێوەی ئازادانە ببنە ئەندامیان و مافی هەڵبژاردنیان هەیە. لەم حیزبانەدا شێوە هەڵبژاردنەکان دواپێکهاتەی دەسەڵاتی حکوومەت دەست نیشان دەکەن. ئەم ئازادیانە (شارستانی و سیاسی) بەدەسکەوتی ئەوپەڕی دیموکراسی لیبرال-ی رۆژئاوا دادەنرێن. لەم روانگەیەیە کە ئێمەی رۆژئاوایی رێزیان بۆ دادەنێین.

بەم پێیە دوو راستی بەدیدەکرێ:

**یەکەم،** ئەم ئازادیانە بۆ ئێمە پڕ بایەخن.

**دووەم،** هەنووکە دیموکراسیی لیبراڵ لە دنیایەکدا درێژە بەژیان دەدا، کە **٢/٣**ی ئەو (دنیایە) سیستەمی سیاسی جیاوازیان هەیە و بەگشتی خاوەنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی جیاوازن. ئەمڕۆکە ئاوێتەبوونی ئەم دوو هۆکارە مەسەلەگەلێکی بێ ئەژماریان سەبارەت بەدیموکراسی هێناوەتە ئاراوە. ئەو پرسیارەی من کردوومە بەشێوەی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەم راستییە سەرچاوەی گرتووە. ئایا ئێمە (رۆژئاوا) دەتوانین سیستەمی بێ وێنەی خۆمان بپارێزین؟ یان ئەوەی ئایا دەتوانین پڕ بایەخترین بەشی ئەو سیستەمە بپارێزین؟

ئەمانە پرسیارگەلێکی سەرەکین، کە لەسەرەتاوە باس و لێکۆڵینەوەیان لەسەرکراوە. بۆ لێدوان لەسەریان چ ئامێرو کەرەسەو پێش گریمانەیەکمان هەیە؟ ئێمە دەبێ ئەو لێکۆڵینەوەو روانگە جیاوازانە کورت و کۆبەند بکەین-ەوە، کە لە یاساکانی ئێمەوە سەرچاوەیان گرتووە.

خاڵی گرینگ و دەسپێك ئەمەیە، کە دەوڵەتی لیبراڵ دیموکراتی لەسەرەتادا لیبراڵ بووەو دەیرِوانییە بازاڕ، دواتر بۆتە دیموکراتیك، واتە زۆر دواتر لەدوای سەقامگیربوون و خۆگرتنی دەسەڵاتی لیبرال، مافی دەنگی دیموکراتیکی پێ زیادکراو بەرهەمی حکوومەتی لیبرال، کە

لە حیزبە نادیموکراتییە رکەبەرەکان پێکهاتبوو و هەروەها بۆ دانانی بارودۆخی گونجاو و گەشەی کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕی رکەبەرایەتی هەوڵی دەدا. پێش ئەوەی کە دەوڵەتی لیبرال ببێتە دیموکراتیك، داواکاریی رێکخراوە دیموکراتییەکان ببووە کارێکی رکەبەرایەتی و لەراستیدا سەرمایەی دیموکراسیی دەخستە سەرریی رکەبەرایەتی.

دووهەم خاڵی گرینگ ئەمەیە کە مافی دەنگی دیموکراتیك وردە وردە حکوومەتی لیبراڵی پشت بەستوو بە ئابووریی ئازادی دەکردە دەوڵەتی چاودێرو دەوڵەتی خۆشگوزەران. هەڵبەت ئەم گۆڕانە هەرچۆنێ بێ ئەنجام دەدرا، چونکە سیاسەتوانانی ئەوکات دەیانزانی کە ئەم گۆڕانە بۆ بەرگریکردن لە مەترسی نارەزایەتییە سیاسییەکان پێویستە. بەڵام دەوڵەتی ئاسایش و دەوڵەتی چاودێر نەیتوانی جێگای بازاڕی سەرمایەداری بگرێتەوە. سەلماندنی ئەم بابەتە پەیوەستە بە سێهەم خاڵ.

خاڵی سێهەم ئەوەیە کە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕ، بیەوێ و نەیەوێ گواستنەوەی هەمیشەیی بەشێ لە هێز وەخۆدەگرێ، چونکە وەها سیستەمێك پێویستی بەموڵکایەتی و چاودێریەکی تاڕادەیەك تایبەتی هەیە. بەڵام ئەویش سەقامگیرکراوی سەرمایە و سەرچاوە گەلێکە، کە لە خزمەت تاقمێکی کەم ئەژماردایە. چونکە باقی جەماوەری کۆمەڵگاش دەبێ دەستیان بە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بگا، بەم جۆرە ناچارن لە جیاتی ئەم دەست پێڕاگەیشتنە نرخێ بدەن و ئەم نرخە زۆرجاران بەشێوەی سپاردنی بەشێ لەهێز (یان بەشێ لەبەرهەمی کاری هێزی مرۆڤایەتییە). دەوڵەتی خۆشگوزەران رەنگە ئەم سپاردنەی هێز لە شوێنەکانی تر و ئەویش لە هەرێمی بچووکدا هەڵسووڕێنێ، چونکە ئەگەر دەوڵەتی خۆشگوزەران پێش بەم ئاڵوگۆڕەی هێزی کار و گواستنەوەی وزەو تواناییەکان بگرێ، بناغەی سەرمایەداریی هەڵوەشاندۆتەوە. لە حاڵێکدا، کە دەوڵەتی خۆشگوزەران بۆخۆی لەسەر بناغەی سەرمایەدارییدا راوەستاوەو دەتوانێ رەوتی بەرهەمهێنان بەڕێوەبەرێ.



بەم جۆرە دەوڵەتی خۆشگوزەران تەنیا بیچمی سەرخانێکە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بەبازاڕ.

چوارەم، بەپێی پێناسەی ناکۆیلانە، کە لەسەر هێزو دەسەڵاتی مرۆڤ دەکرێ، یان بەپێی پێناسەی جەوهەری مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی خاوەن هەڵوێست لەناخی خۆیدا گواستنەوەیان سپاردنی هێز (هێزی کار) کە خودی سەرمادارییە، بەدابەزینی عادەت و حەقیقەتی مرۆڤ دادەنرێ.

پێنجەم، بەگشتی کاتێ تیۆری سەلمێنەری کۆمەڵگای بازاڕی لیبرال دیموکراتیك، بەپێی تیۆری زۆرینەسازی بێ، تیۆری ناوبراو ناتوانێ بەشێوەی کارلێهاتوو سیستەمەکە بسەلمێنێ، چونکە ئەم تیۆرە دەسەلمێندرێ. ئێوە نەتەنیا دەتوانن نیشان بدەن، کە ئەگەر ئێمە وافەرز بکەین کە دابەشکردنی بەشێ لە دراوەکان ئەنجام دەدرێ ئەوکات بازاڕ دەتوانێ ئاسوودەیی بەوپەڕی خۆی بگەیەنێ، بەڵام بازاڕ دەتوانێ تەنیا ئەو نیازانە بەجێ بێنێ کە جەماوەر بوار یان توانای کڕینی ئەوانیان هەبێ. لە کۆمەڵگایەکی سەرمایەداریی بازاڕیدا هەرچەندیش تەواو رکەبەرایەتی بێ، دراوەکان هیچ کات بەپێی رادەی هێزی کارو شارەزایی دابەش ناکرێن، چونکە بازاڕ دەبێ بۆ سەرمایە و موڵکایەتیی کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان و هەروەها بۆ وەکارخستنی ئەم دوو هۆکارە پاداشت دابنێ.

سەرەڕای ئەوانە ئێمە بازاڕی سەر لەبەر رکەبەرایەتیی پێشوومان تێپەڕکردووە، بەهەر رادەیەك کە دامەزراوە ئابوورییەکان دەسەڵاتی چاودێری و نرخ دانان وەئەستۆ دەگرن، بەهەمان رادە مەبەستەکانیان لەرێی زۆرینەسازیی ئاسوودەیی کۆمەڵگا دوورکەوتۆتەوە.

شەشەم، بنەڕەتی ئەخلاقی و کۆتایی، لە گشتیترین حاڵەتی خۆیدا و لە تیۆرە سەلمێنەرەکانی هەر سێ چەشنی دیموکراسیدا بنەڕەتێکی نەگۆڕە. هەر سێ چەشنی دیموکراسی گەشەو بەئاکام گەیشتنی توانا مرۆڤایەتییەکانیان کردۆتە دوا مەبەستی خۆیان و لەم روانگەیەوە ئەندامانی کۆمەڵگا بە بەرابەرو وەکو یەك دادەنێن. هەرسێکیان رۆح و جەوهەری

مرۆڤایەتی بەهەڵسووڕان بۆ گەیشتن بە مەبەستی ئاگادارانە و قاعیدەمەند، دەسەلمێنن و پێیان وایە، کە بە ئاکام گەیشتنی ئەم رۆح و عادەتە پەیوەستە بە ئازادی و بەرابەی؛ رزگاریی مرۆڤ لە لغاوی دیتران و بەرابەری لە بە ئازادی گەیشتن.

جیاوازییەکانی ئەم سێ تیۆرە لە نزمترین پلەو لە ئاستی پاژەکاندا بەرچاون. بەکورتی دەتوانرێ بگوترێ کە سەرەکیترین لایەنی جیاکەرەوەی ئەوان لیبرال و نالیبرال بوونی هەرکامیانە، کە لە دوو روانگەی دواتردا تێدەکۆشین و باسیان بکەین.

حەوتەم، ئەوەیە کە ئێمە خاڵێکی هاوبەش لەنێوان مانای نالیبرالیی دیموکراسی، یان بەواتایەکی تر دیموکراسیی مارکسیستی، کە لە وڵاتانی بەرەی یەکێتی سۆڤیەتدا باوەو هەروەها مانای رۆسۆیی (ژان ژاك رۆسۆ) لە دیموکراسی، کە لە تایبەتمەندیی وڵاتانی تازەسەربەخۆیی، بەدیدەکەین. هەر دووکیان لەسەرئەم باوەڕەن کە کۆمەڵگای پشت بەستوو بەبازاڕ ناتوانێ مافە مرۆڤییەکان یان ئازادییە تاکەکەسییەکان، کە پێویستە یەکسان بن، ئامادە بکا. بەم جۆرە دووربوون لەبازاڕ دەکەنە یەکەم دەستووری کاری خۆیان. ئەوان هۆگری موڵکایەتی و وەدەستهێنانی ئازادیی موڵکایەتی تاك نین. چونکە پێیان وایە دژی دوو روانگەی ئازادی و بەرابەری-ن. لەلایەکی ترەوە لەتەرازووی بایەخەکانیاندا هیچ بایەخ یان نۆرەیەکی سەرەکی بۆ ئازادییە سیاسییەکان دانانێن. ئەوان بەم باوەڕە، کە گرینگترین لایەن بنیاتنانەوەی کۆمەڵگایەو ئەویش پێویستی بەدەسەڵاتی سیاسی هەیە، ئامادە نین بوار بە ئازادییە سیاسییەکان بدەن، هەتا نەوەك هێزی ئەوان لەنێو رێگای بنیاتنانەوەی کۆمەڵگادا تووشی لەمپەر بێ. بەم پێیە ئازادییە سیاسییەکان لە پلەی نزمتر دادەنیشن. لەراستیدا ئازادی بۆ یەکسانیی قوربانی دەکرێ یان باشترە بڵێین ئازادییە ئامادەکان لەرێی ئەو ئازادیانەی بەڵێن دراون بەخت دەکرێن. لەم روانگەیەوە خۆی رەتدەکاتەوە، بە ئازادی گەیشتن لە داهاتوودا واتە رەتکردنەوەی ئازادیی هەنووکە.



هەشتەم، تێگەیشتنی لیبرالی لە دیموکراسی لەسەر ئازادییە ئامادەکانی نێو بازاڕ و ئەو ئازادییە سیاسیانەی داکۆکی لە سیستەمی حیزبە رکەبەرەکاندا دەکا دەسەڵاتدارن و دەکەوێتە نێو دژوارییەکی تر. ئازادیی نێو کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ، ئازادی وەچنگهێنانی قازانجی ماددی و موڵکایەتی سەرماییەکان بەدی دێنێ. ئازادی وەچنگهێنان و موڵکایەتی پێویستن، چونکە کۆمەڵگای بازاڕی بەداکۆکی کردن لەسەر ویست و داخوازی بەڕێوەدەچێ. ئازادی وەچنگهێنان بۆ کۆمەڵگای بازاڕی تا ئەو ڕادەیە بنەڕەتییە، کە زۆر جاران لە سیستەمە بایەخدارەکەیدا پلەی یەکەم تایبەت بەخۆی دەکا. بەڵام ئەم ئازادییەش خۆی رەتدەکاتەوە، چونکە هەرچەند لە بواری شارەزایی و هێزدا نابەرابەرییەکان بەدی دەکرێن، بەڵام وەها ئازادییەك بەو جێیە دەگا کە تاقمێك سەرچاوەو سەرمایە و هەروەها کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان لە خزمەت خۆیان دادەنێن و زۆرینەی کۆمەڵگای لێ بێبەش دەکەن. بەم جۆرە بەشێ لە کۆمەڵگا ئازاد نین ویست و نیازی خۆیان وەدەست بێنن. ئەوان ناچار دەبن بۆ وەدەستهێنانی کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان هێزی کاری خۆیان بفرۆشن.

نۆهەم، پێشکەوتنە پڕ تەکنیکییە زەینییەکان، کە بەرهەمی سەرمایەداری-ن، بەشێوەیەکی بێ وێنە بەرهەمهێنان و بەرهەمە ماددییەکان-یان زۆر کردووە و ئەم کارە لە هەموو شوێنێکی جیهاندا شوێنەواری جۆراوجۆری لەسەر ئازادی و رۆحی مرۆڤایەتی داناوە. لە رۆژئاوادا زاڵ بوونی بەرهەمهێنانی ماددی و زۆربوونی رادەی ماددی رۆشناییان خستۆتە سەر کەموکوڕییەکان-ی کۆمەڵگای سەرمایەداری و لەسەر ئازادی و یەکسانیی ئامرازە تاکەکەسییەکان بۆ گەیشتن و بەئاکام گەیاندنی جەوهەری مرۆڤایەتی کاریگەر بوون. هەروەها لە وڵاتە ناسەرمایەدارییەکانیشدا نیاز بەزۆربوونی بەرهەمی ماددی تاڕادەیەکی زۆر بۆتە هۆی نەبوونی ئازادی. لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا بە کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتی دەوڵەت و قەرەبوو کردنەوەی ئەم گرفتە پێویستی بە پتەوبوونی



PDF 4 KURD

زۆرەملانەی سەرمایەی کۆمەڵایەتی هەیە،  واتە زیاتر لەجاران وەکارخستنی زەبر و زەنگ پێویست بووە، کە ئەمە بۆخۆی بەرتەسك کردنەوەی ئازادییە.

دەیەم، لە ئاکامی پێشکەوتوویی تەکنیکی، ئوتومایسون و دۆزینەوەو چاودێریی سەرچاوەکانی هێز و توانای نامرۆڤی ئەوەبووە، کە لە دەیەی ئێستادا زۆرینەکردن، زیاتر لە پێشەوە بووە بەڵام لەوسەرەوە کە ئەم زۆربوونانە لە هەنووکەدا تەنیا بەوڵاتە سەرمایەدارییەکانەوە بەرتەسك ناکرێ و بەشێکی-شی پێوەندی بە وڵاتە سۆسیالیستەکانەوە دەبێ  تەنانەت کەموکوڕییەکانیشی تووشی کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان نابێ، بەپێچەوانە وەها زۆر بوونێك لە داهاتوودا دوولەمپەری زۆر بەرچاو دادەنێ، کە پێشتر پێشبینی دەکرا؛

 یەکەم ئەوەی کە تایبەتمەندیی لیبرال- سەرمایەداری دەکێشرێتە نێو رکەبەرایەتیی ئایدیۆلۆژیکی، کە زۆر جیدییە و هەڵگری تایبەتمەندییە سۆسیالیستییەکانی یەکێتی سۆڤیەتە. دووەم ئەوەی کە ئاستی ویستی ئەو نەتەوانەی لەحاڵی گەشەدان دەچێتەسەرێ و دەرەنجامی ئەوەش هەست بە نابەرابەی پێداویستییە مرۆڤییەکان دەکرێ، کە لە ئاستی جیهانی و لەنێوان دووجەمسەری هەژارو دەست رۆیشتوودان. ئەم نابەرابەری و بێ عەداڵەتییە تارادەیەك لەسەر ویژدان-ی رۆژئاوا قورسایی دەکاو رەنگە کردەوە ئەخلاقییەکەی بەهێزتربێ.

هەنووکە بە پۆلینکردنی ئەم لایەنە دە ژمارەییە دەتوانین بگەڕێینەوە سەر پرسیاری سەرەکی و تەوەری باسی خۆمان. ئایا ئێمە لە دیموکراسی-ە لیبرالەکاندا دەتوانین بایەخی ئازادی و تاك بوون هەر بەوجۆرە بپارێزین، کە کردوومانەتە ئامانجی خۆمان و پەرەی پێدەدەین؟

پێم وابێ ئەو شۆڕشە کۆمۆنیستی و بزووتنەوانەی لە وڵاتانی لەحاڵی گەشەدا سەریان هەڵداوەو هەموویان پێکەوەن شێوە ژیانی رۆژئاوایی دەخەنە بەر مەترسییەوە، دەبنە زامنی ئامانجی ئێمە. ئەگەر دەرەنجام و فێرکارییەکانی ئەم شۆڕشانە بخوێنینەوە فێرمان دەکەن، کە چۆن ئامانجەکانی خۆمان بپارێزین و وزە وەبەر بایەخە لیبراڵییەکانمان بنێین. هەنووکە بایەخە



لیبرالییەکان دەبێ لەگەڵ بایەخە دیموکراسییە نالیبرالییەکان رکەبەرایەتی بکەن. ئەمە لە حاڵێکدایە، کە لەوە پێشتر ناچار نەبوون ئاوا هەڵسوکەوت بکەن.

بەڵام هەر ئەو هۆکارەی رکەبەرەکانی دیموکراسیی لیبرالی هێناوەتە مەیدان، دەتوانێ لە بەڵای دوولایەنی سەرمایەداریی لیبرال رزگارمان بکا. ئەم هۆکار یان روانگەیە ئەوەیە، کە تەکنیکە بەرهەمهێنەرەکانی هەنووکە و داهاتووی سەرمایەداری دەتوانن بەرەو کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان بگوازرێنەوە و بە یارمەتی ئەم پێشکەوتنانە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان دەتوانن ئازادی و بایەخی مرۆڤایەتی پتەوتر بکەن. ئەگەر بمانەوێ و بڕوانینە ئەو قۆناغەی کە تێیداین دیمەنی پێگەیینی هێزە بەرهەمهێنەرەکان، ئێمە لە دوولایەنی کۆمەڵگای سەرماداریی پشت بەستوو بە بازاڕ رزگار دەکەن، چونکە تا کاتێ ئەم دوولایەنە هەیە کە وا بێتە بەرچاوی بارودۆخی هەمیشەیی مرۆڤ، بارودۆخی کەمبوونی سەرچاوەکان و ویستی بێ بڕانەوەیە. دوولایەنی ئەوەیە، کە ئەگەر ئێمە ئازادی بەکەسانێ بدەین، کە هاوتا و بەرابەرین، لەراستیدا ئازادی و بەرابەریمان رەتکردۆتەوەو ئازادی و مافی زیاترمان بە کەسانێ داوە کە هێزو شارەزایی زیاتریان هەیە، چونکە بۆ گەیشتن بە ژیانی سەرلەبەر مرۆڤایەتی، ئازادی دانوستاندن و موڵکایەتیی کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان هاوتایە لەگەڵ وەچنگهێنانی بەرابەریی ئامرازە بەرهەمهێنەرەکان. لەراستیدا دەبێ یەکێك لەم دوو رێیە هەڵبژێردرێ؛ لە هەمانکاتی رەتکردنەوەی مرۆڤایەتیدا قبووڵ کردنی ئازادی بۆ هەموو بێجگە لە خاوەنانی هێزو پسپۆڕی، یان رەتکردنەوەی ئازادیی بە قازانجی بەرابەربوونی پێداویستییە مرۆڤایەتییەکان. کۆمەڵگای سەرمایەداریی لیبرال، ئازادی هەڵبژاردن و مافە مرۆڤییەکانی بۆ هەموو رەتکردۆتەوە. بەڵام ئیتر ئەم هەڵبژاردنە هیچ پاساوێکی بۆمانەوە نییە، ئەم هەڵبژاردنە لەو شوێنەوە سەری هەڵداوە، کە سەرچاوەکان زۆر کەمبوون و دەرەنجامەکەی دەبوایە خواستی ئازادیی لە رادەبەدەر بۆ موڵکایەتی و وەچنگهێنان وەگەڕیان بکەوتبوایە هەتا بەرهەمهێنان بەڕادەی گونجاو باش بکا.

کەموکوڕیی کۆمەڵگای لیبڕال، کەمبوونی ئەو سەرچاوانە بوو کە ویستە بێ بڕانەوە مرۆڤییەکانی بەجێ دێنا. لەڕاستیدا کاتێ کارەسات روویدا، کە سەرچاوەکان کەمبوون و ویستەکانی بێ پایان و درێژەی ئەم بارودۆخەش بوو بە تراژیدیا. بەڵام هەنووکە ئەم بارودۆخە بۆ ئێمە بۆتە میلۆدراسێك. هەنووکە دەتوانرێ کەمبوونی سەرچاوەو خواستە بێ بڕانەوەکان بەکەسایەتییەکی نێگەتیڤانە لە میلۆدرام دابنرێ، کە پێش کۆتایی شانۆ دەتوانین لەسەر شاشەوە دەرینێین، هەنووکە بە ئاشکرایی دەبینین، کە روانگەی کەمبوونی سەرچاوەکان و لە بەرامبەر ئەویشدا خواستە بێ بڕاوەکان، دەرەنجامی کۆمەڵگای سەرمایەداریی پشت بەستوو بە بازاڕ بووە. هەڵبەت پێش هاتنە ئارای کۆمەڵگا هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد کەویستی بێ بڕانەوەی مرۆڤ، تایبەتمەندیی خودی و سروشتی مرۆڤە. وەها تێگەیشتنێك لە بۆچوونەکانی ئەرەستۆ یان ((سەن تۆماس ئاکۆئیناس))دا نابیندرێ. سەرەتای ئەم بۆچوونە تەنیا لەکاتی هاتنە ئارای کۆمەڵگای سەرمایەداری لە سەدەی حەڤدەو تیۆرەکانی ((هابز)) و ((لاك))دا بووە، کە ((جیمزمیل)) لەسەرەتای سەدەی نۆزدە ئەم ئەندێشەی پێ گەیاند. بەپێی تیۆرەکانی ئەو ((گەورەترین یاسای دەسەڵاتداری ژیانی مرۆڤایەتی)) ویست و چاوچنۆکی مرۆڤە بۆ داگیرکردنی هێزو ماڵ و سامانی دیتران هەتا دیتران بخاتە ژێردەست و کۆیلەی خود.

دووچەشنی ناوبراو تەنانەت کاتێ ((جیمزمیل)) مشتومڕی لەسەر دەکرد هێشتا دووچەشنییەکی راستەقینەبوو. بەڵام ئەمڕۆکە بەوشێوەیە نییە. ئێمە کە دەتوانین لەڕێی بەرهەمهێنان و تەکنولۆژیای هەنووکەیی ئەم دووچەشنییە جێبەجێ بکەین. ئێستاکە دەتوانین تێبگەین کە مرۆڤەکان لەزاتی خۆیاندا وانین کە ئەرخەیان بن، بەڵکو کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ ئەوانی بەرەو ئەم عادەتە هانداوە. رەنگە سەیربێ، کە بڵێین کەمبوونی سەرچاوەکان دەرەنجامی خۆگرتنی کۆمەڵگای بازاڕیی بووە.



ئایا مرۆڤ بەردەوام لە هەژاری و برسێتیدا نەبووە، ئەویش لانی کەم دوای سەردەمی زێڕینی کۆن؟ بەم حاڵە کەمبوونی سەرچاوەکان بە تەواو مانا دەسکەوتی کۆمەڵگای بازاڕی بووە. لەڕاستیدا بۆچوونی کەمبوون و قاتی خولْقا، هەتا بەربەرەکانی لەگەڵ بکرێ و مەبەستی مەزنی مرۆڤ هەوڵدان بێ بۆ چارەسەرکردنی ئەم قاتی-یە. بەم پێیە کەمبوونی سەرچاوەکان لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی بازاڕدا وەکو تەوەرێکی بنچینەیی پێویست بوو، بۆیە کەوتە ریزی پێشەوەی هۆشیاریی مرۆڤ. چەمکی کەمبوونی سەرچاوەکان تەنیا کاتێ بوو بە تەوەر، کە کۆمەڵگای سەرمایەداری خەریك بوو بەسەریدا زاڵ بێ. ئەم تیۆرە بەهۆی رەوتی رێکخەری زاڵبوون بەسەر ئەم باسەدا (کەمبوونی سەرچاوەکان) هاتە ئاراوەو، خستنەسەر رێی ئاگاداری بۆ چارەسەرکردنی کەمبوونی سەرچاوەکان دەبێ خۆبگرێ هەتا بوونی سەرمایەداریی بسەلمێنێ و هێزی پیرۆز و پێویستی لە خزمەت دابنێ.

ئاگادارییەکی تەواو لە بابەت کەمبوونی سەرچاوەکان پێویست بوو هەتا وەگەڕخستنی لایەنەکانی سەرەوەو هەروەها نیاز بە دژوارتر کارکردنی چینە نزمەکان بسەلمێنێ.

هەنووکە ئیتر پێویستییەك بەم چەمکە نییە. هەروەها بۆ گەورە نیشاندانی شوێنی وەچنگهێنانی سەرمایە پێویستیمان بە ئەخلاقەکان نییە. ئێستا خواستی ئازادیی بێ بڕانەوە بۆ وەچنگهێنانی سەرمایە، بێ مانایە، لانی کەم لە پێشکەوتووترین وڵاتانی سەرمایەدارییدا کاڵا و بەرهەمی کۆمەڵایەتی و سەرمایەداریمان هێندە بەرهەمهێناوە، کە بتوانین کاریان پێ بکەین.

لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا گرفتی ئێمە ئیتر دۆزینەوەی ئیش وکار بۆ خەڵك نییە، بەڵکو دامەزراندنی کار-ە. ئیتر گرفت فێرکردنی چۆن کەڵك وەرگرتن لە ئامرازە بەرهەمهێنەرەکان نییە، کە بەدەگمەن وەچنگ دەکەون، بەڵکو دەسپێکردنی قەرەبووی کەم رەنگ بوونی بایەخە مرۆڤییەکانە، کە نەیانتوانیوە لە بەرامبەر کەمبوونی سەرچاوە و سەرمایە ماددییەکاندا راوەستن و بەربەرەکانێ بکەن.



PDF 4 KURD

بەناوبانگترین لیبرالی بەریتانیا ((جان مەینارد کینز)) سی و پێنج ساڵ لەوەپێش توانی مەزنایەتی گۆڕانکارییەك پێشبینی بکا، کە ڕەنگە ببێ و پێویستە رووبدا. ئەو لە وتارێکدا بەناوی پێداویستییە ئابوورییەکان بۆنەوەکانمان لە ساڵی ١٩٣٠ز-دا ئاوا دەنووسێ:

"کاتێ کەڵەکەکردنی سەرمایە، گرینگایەتییەکی کۆمەڵایەتی بەرچاوی نەبێ، ڕەهەند و بنچینە ئەخلاقییەکان تووشی گۆڕانی سەیر و سەمەرە دێن. دەتوانین خۆمان لەزۆر بنەڕەت و بنچینەی ئەخلاقی رزگار بکەین، کە ماوەی دووسەد ساڵە وەکو کابوسێك ئێمەی ترساندووە و هەروەها چۆنیەتی و عادەت و خوخدەی نەفرەتاوی-شی مەزن کردووە. ئێمە بەو غیرەت و بوێریە دەگەین کە بایەخی راستەقینەی بزوێنەرە پارەیی و ئابوورییەکان نیشان بدەین... بەم شێوەیە ئێمە ئازادین گشت سوونەت و دابونەریتی کۆمەڵایەتی و چالاکییە ئابوورییەکان وەلابنێین. هەر ئێستاکە دابونەریت و سوونەت هەرچەندە نەفرەتاوی یان ناعادڵانە بن بەڵام دەیانپارێزین. چونکە ئەم سوونەتانە بەشێوەیەکی بەرچاو لەبەرەو پێشبردن و گەشەی سەرمایەکانمان دەوریان گێڕاوە.

... بۆ جارێکی تر ئێمە پێمان وایە کە مەبەستەکان لە کەرەسە و ئامرازەکان باشترن. بایەخ بۆ مەبەستەکانمان باڵا دەستترە و سەرنج بە کەرەسەکان نادەین و هەروەها پێمان وایە کە باش بوون لە قازانج ڕەواترە.

... بەڵام (ئەو درێژە دەدا) وریا بن! هێشتا کاتی ئەوەنەهاتووە چونکە لانی کەم سەد ساڵی تر ئێمە و دیتران دەبێ وای نیشان بدەین، کە عەداڵەت نەهاتییەو نەهاتی عەداڵەتە. چونکە نەهاتی باشە، بەڵام عەداڵەت نا. چاوچنۆکی و ماڵ پەرستی و سوود و سەلەم خۆری و وریایی ئێستاکەش هەتا ماوەیەکی تر خوداکانی ئێمەن، چونکە تەنیا ئەمانە دەتوانن ئێمە لە تاریکخانەی پێویست بوونی ئابوورییەوە بەرەو ڕووناکایی، ڕێنوێنی بکەن" (٧).



"کینز" ئەم وتانەی بۆ سەد ساڵی دوای ١٩٣٠-ز دەربڕیوە. بەڵام لەوکاتەوە تا بەئێستا گۆڕانەکان هێندە بەخێرا وەگەڕ کەوتوون، کە دەتوانین بڵێین ئیتر کاتی وەلانانی ئەخلاقیاتی کەمبوون و نەبوون هاتووە. تەنیا بەوە بەرچاونەگرتنی ئەو کاتەیە دەتوانین دژوارییەکانی نێو تێگەیشتنی بازاڕ لە ئازادی و هەروەها لە ڕۆح و جەوهەری مرۆڤایەتی جێبەجێ بکەین. واتە ئەو چەمکانەی کە هاتبوونە نێو تیۆری سەلمێنەری دیموکراسیی لیبرال. ئەوکات دەتوانین هیواداربین، کە بایەخە دیموکراتییەکانی ئازادیی بەرابەرمان وەچنگهێناوەو وەکو یەك بەژیانێکی ڕێکوپێك گەیشتووین.

ئەم دەرەنجامانە زۆرباش و دڵخۆشکەرن بەڵام لە کردەوەدا چۆن دەتوانین بە ئاکامیان بگەیەنین؟ لەراستیدا دووگرفتی گەورە هەیە، کە دەبێ بەسەریاندا زاڵ بن و جێبەجێیان بکەین. گرفتی یەکەم سەبارەت بەدەسەڵاتە. میللەتان و وڵاتانی جیهانی لیبرال دیموکراتی، کە سەدان ساڵە لە کۆمەڵگا رکەبەرییەکانی بازاڕدا دەژین وەها خوویان بەئاکاری داگیرگەرانە گرتووەو تامەزرۆی دەستدرێژکردنن بۆ وەچنگهێنانی دەسەڵات، کە بەم ئاسانییە لەو چوارچێوە زەینیە رزگار ناکرێن. ڕەنگە لە روانگەی ئابوورییەوە بتوانن دەسەڵات وەلابنێن بەڵام کاتێ پێکهاتەی گشتیی کۆمەڵگای ئەوان لەسەر بناغەی دەسەڵاتخوازی دامەزراوە چ تاکی یان گشتی و چ ئابووری یان سیاسی، ئەوان چۆن دەتوانن خۆیان لەم عادەتە دوور بخەنەوە؟

گرفتی دووەم، گرفتی زاڵبوون بەسەر کەموکوڕیی سەرچاوەکانە. ڕەنگە بڵێین، کە لە روانگەی مندا واتە زاڵبوون بەسەر کەمبوونی سەرچاوە ماددییەکان، کە نزیکە پێك بێ، چەشنی بێ ئاگایی دەبیندرێ. من ئەم راستییەم وەبەرچاو نەگرتووە، کە درێژ ماوە لە وڵاتانی لە حاڵی گەشەدا هەژاریی گشتگیر و کەمبوونی سەرچاوەکان هەبووەو دەبێ. ئەمە لە بابەت گشت وڵاتە کۆمۆنیستییەکان، بێجگە لە پێشکەوتووترین وڵاتاندا راستە، ڕەنگە



PDF 4 KURD

بەم جۆرە بۆچوونی "لۆردکینز" کە بۆ "سەدی" ساڵی داهاتوو پێشبینی کراوە زۆریشی نەخایاندووە.

پێم وانییە، کە ئیتر بتوانرێ ئەم گرفتە بەڕەوا بزانرێ، کە لە کاتی شیکردنەوەی ئەم گرفتەدا بۆچی وەڵامی یەکەم گرفتیش نەدەینەوە. گرفتی دووەم خۆڕاگرنییە، چونکە وڵاتانی لەحاڵی گەشەو وڵاتە کۆمۆنیستییەکان بەدوای زاڵبوون بەسەر مەسەلەی کەمبوونی سەرچاوەکانن ئەویش لەشێوازێکی جیا لە شێوازی رۆژئاوایی (بازاڕی). ئەوان هەر لەسەرەتاوە ئەخلاقە بازاڕییەکانیان رەتکردۆتەوەو هەنووکە هەوڵ دەدەن، کە بەبێ پشت بەستن بە (ئەخلاقە بازاڕییەکان) بەسەر مەسەلەی ناوبراودا زاڵ-بن.

هەروەها وڵاتە کۆمۆنیستییەکان، کە زۆر پێشتر لە وڵاتە تازە سەربەخۆکان هەنگاویان ناوەتە ئەم رێگایەوە نیشانیاندا دەتوانن بەبێ بازاڕی خاوەنانە و پشت بەستوو بە بنچینەی مولکایەتی، بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ بن و هەروەها دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن. تەنانەت وڵاتانی لەحاڵی گەشەدا هەرچەند هێزی سەربازی یان ئابووریان نییە. بەڵام لە بەراورد لەگەڵ هێزە سەرمایەداری و کۆمۆنیستییە مەزنەکاندا توانیویانە لە وەگەڕکەوتنی کاروباری نێو نەتەوەییدا دەنگی خۆیان بەگوێی دیتران بگەیەنن و، هەتا ئەو شوێنە کاریگەر بن کە دەسەڵاتی ئەوەیان بووە بۆچوونی خۆیان، دەربڕن.

من لەسەر دەسەڵاتی وڵاتانی لە حاڵی گەشەو هەروەها وڵاتە کۆمۆنیستییەکاندا داکۆکی دەکەم، چونکە پێم وایە ئەم لایەنەی کە زۆرجاران لێی غافڵ بووین زۆرگرینگە. ئەم وڵاتانە نیشانیان داوە، کە دەسەڵات تەنیا بە هەڵسووڕان، تواناییەکان، ئەخلاقە بازاڕییەکان پەیوەست نییە. ئەوان دیاردەی بازاڕیان رەتکردۆتەوەو نە تەنیا تووشی لاوازی دەسەڵات نەهاتوون، بەڵکو پڕ هێزتریش بوون. بەم پێیە ئاکاری بازاڕی بە تەنیا سەرچاوەی هێز دانانرێ. کاتێ لایەنی ئاماژەپێکراوی ئەم راستییە بناسرێ، تا ئەو شوێنە دەڕوا کە وەڵامی



یەکەم کێشەی ئێمە دەداتەوە. ئەم کێشەیە بزرکردنی عادەتە لەمێژینەکانی ئاکاری رۆژئاواییە سەبارەت بە رێگاکانی وەدەستهێنانی دەسەڵات، کە بەگشتی لەسەر بناغەی ئاکار و ئەخلاقە بازاڕییەکان و مولکایەتی و سەرمایە کۆکردنەوەدا دامەزراوە.

کاتێ دەبیندرێ ئاکاری قازانجخوازانەی بازاڕ، تەنیا سەرچاوەی دەسەڵات نییە، ئەوکات گرفتی رۆژئاوا چارەسەر دەکرێ. گومان لەوەدانییە کە جەماوەر و نەتەوەکان هەر بەدوای وەچنگهێنانی دەسەڵاتەوەن، بەڵام ئیتر بۆ ئەم مەبەستە پێویست نییە لەچاو وەدەستهێنانی ئازادی، داگیرکردنی سەرمایە مادديیەکان بەڕەواتر بزانن. لەراستیدا ئەوان نە تەنیا دەبێ لە خواستی زۆربوونی دەسەڵات دەست هەڵگرن، بەڵکو سەیرە ئیتر بتوانن بەم شێوەیە بەدەسەڵات بگەن.

لەنێوان رۆژئاواو رۆژهەڵاتدا (بە وڵاتانی لەحاڵی گەشەیەوە، کە هەنووکە هۆکارێکی زۆر گرینگن) بۆ وەدەستهێنانی هێز (دەسەڵات) و شوێنی خۆنیشاندان، رکەبەرییەکی دوورودرێژ لە ئارادابووە و هەیە. شەڕو پێکدادان لەنێوان زل هێزاندا بۆ دانانی هاوسەنگی هێز، ئیتر شێوەیەکی باش و گونجاو نییە. گشتگیربوونی چەکە ناوەکییەکان بە ئاشکرایی ئەم راستییە نیشان دەدەن. بەم شێوەیە هێزو تاڕادەیەك جێ خۆشکەریی نەتەوە جۆراوجۆرەکان و بەشە جیاوازییەکانی جیهان بەرەو شوێنێ دەڕوا، کە بەپێی رادەی دابینکردنی ئاسایشی زۆربەی جەماوەر دەستنیشان دەکرێ. ئەوەندەی کە ئەم نەتەوانە دیموکراتی بن (بەهەر کام لەو سێ چەشنە دیموکراسیانەی ئاماژەمان پێکردن) هەر بەو رادەیە دەتوانرێ چاوەڕوانی بکرێ کەویستی خەڵکی ئەوان مافی مرۆڤایەتی بەرابەر و دەست پێڕا گەیشتنی هاوتایە بە کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی پەسندکراو.

ئەو کۆمەڵگایانەی سیستەمی سەرمایەدارییان رەتکردۆتەوە، لە کاردانەوە لە بەرابەر ئەم خواستانەدا ئیمتیازێکی ئەخلاقی و عەیبێکی ئەخلاقییان هەیە. هەوێنی هێز یان قازانجی

ئەخلاقیی ئەوان ئەوەیە، کە هیچ مرۆڤێك ناچار ناکەن هەتا بۆ بە ئاکام گەیاندنی ویستەکانی خۆی، بەشێ لە هێزی کاری خۆی بۆ دیتران و بەقازانجی دیتران بگوازێتەوە. هەوێنی لاوازی یان عەیبێکی ئەخلاقی ئەوان ئەوەیە، کە ناتوانن بەقەد یەك ئازادییە سیاسی و مەدەنی، هەر بەو شێوەیە لە وڵاتە سەرمایەدارییەکانی لیبراڵێدا باوە، بۆ خەڵکی دابین بکەن.

لەحاڵی حازردا هیچ پێوانەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی کردەوەی جەماوەر لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئیمتیاز و لاوازییدا نییە. ئێمە بەهیچ چەشنە هەڵسەنگاندنێکی پۆزەتیڤانە و نێگەتیڤانەیەك ، کە بتوانین لەسەری کۆك بین، ناگەین. بەم هۆیەش بەمتمانەوە ناتوانین هاوتەوازییەکی بەردەوام لەنێوان لایەنە باشە ئەخلاقییەکان بۆ وێنە لەنێوان دوو کۆمەڵگادا بنێین. بەڵام ئەگەر بتوانین ئەو گۆڕانکارییە بایەخدارانەیە پێشبینی بکەین، کە لەهەر کام لە فاکتەرەکانی کۆمەڵگا ناوبراوەکاندان، ئەم گۆڕانە پێشبینی کراوانە لەنێو کۆمەڵگا جیاوازەکاندا هاوتاو بەرابەر نەبن، ئەوکات دەتوانین لە بابەت ئاڵوگۆڕیی نێو لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەخلاقی جۆرە کۆمەڵگایەك بدوێین، کە لە بەراورد لەگەڵ چەشنەکانی تر دادەنرێن. وابیردەکەمەوە دەتوانرێ کە وڵاتە نالیبراڵییەکان بەپاراستنی قەوارەی هەنووکەیی گواستنەوەی دەسەڵات (ناجەبری) ئەم ئیمتیازە ئەخلاقییەش دەپارێزن و تاڕادەیەك نابەرابەرییە سیاسییەکان و نەبوونی ئازادییە شارستانییەکان-یش قەرەبوو دەکەنەوە. ئەم وڵاتانە بۆ دانان و وەگەڕخستنی ئازادییە ناوبراوەکان زۆر هۆکاریان هەیە و هەر کە هەلومەرجی دانانی (ئازادییە ناوبراوەکان) دەستەبەرکرا، دیارە کە ئەم ئازادیانە بەئاکام دەگەیەنن، چونکە حکومەتێکی پۆلیسی بۆ هەر حاکم و دەسەڵاتدارێك پڕ خەرج و کێشەیە. ئەم دەستە وڵاتانە لە هەمانکاتی پاراستن و بەهێزترکردنی توانای زۆربەرهەمهێنان بۆ دابینکردنی ویستەکانی جەماوەر، توانای ئەوەیان هەیە، کە بەشێوەی سروشتی سیستەمێکی سیاسی خۆڕاگر دابین بکەن.



لێرەدا ئەگەر وڵاتانی سەرمایەداریی لیبراڵ تەنیا بیانەوێ هێزو لاوازیی ئەخلاقی خۆیان بپارێزن، هاوتەرازی بەزیانیان تەواو دەبێ و هێزی ناتەواوی ئەوان بەرەو نزمی دەچێ. ئەو کۆمەڵگایانەی دەتوانن ویستی مرۆڤەکان بۆ بەرامبەری مافە مرۆڤییەکان بەجێ بێنن، بەردەوام دەبن. مەبەستم ئەوەیە کە لەمەوبەردا لەجیهاندا هێزو دەسەڵات پەیوەستە بە ئیمتیازە ئەخلاقییەکانەوە. باوەڕم وایە، کە ئێمە لە ڕۆژئاوادا هێزی خۆمان لە دەست دەدەین، مەگەر ئەوەی قازانجخوازیی لە بازاڕدا وەبەرچاو نەگرین. چونکە ئێمە تەنیا هێزو دەسەڵات دەبینین، ئەم بابەتەش گرینگ و چارەنووسساز دەبێ.

ئەخلاق خوازان و زانایانی زانستە ئاینییەکان زۆر لەمێژە رایانگەیاندووە کە ئێمە بایەخی ناڕاستمان هەڵبژاردووەو لەم بابەتەوە، کە وەچنگهێنانی سەرمایەمان لە بایەخە مەعنەوییەکان پێ باشتربووە، تووشی هەڵە هاتووین. ئەم بۆچوونەی ئەوان لە سێ یان چوار سەدەی رابوردوودا وەها شوێنەوارێکی نەبووە، چونکە لەگەڵ خوازیاریی هێزی تاك-ی یان نەتەوەیی، کە کۆمەڵگای پشت بەستوو بە بازاڕ دەروەستی بووە، نەسازاوە. بەڵام ئەگەر بەهەڵە نەچوبێتم هەر لە ئێستاوە دەسەڵات بەرەو شوێنێ دەڕوا، کە پێویستی بە بایەخە ئەخلاقییەکان دەبێ. بەم شێوەیە خواستی دامەزراوە لەسەر ئەخلاقیات و دەسەڵات دەبێتە هاوڕێ و هاوسەنگی ئەوان و هەروەها ڕێی گەییشتن بە دەسەڵاتی نەتەوەیی ناساندن و باڵا دەستکردنی مافە مرۆڤییە بەرابەرەکانە. گەر بەدوای ئەم ئامانجەدا بڕۆین دەسەڵاتی تاکی بەرفراوان دەبێتەوە، هەڵبەت ئەم بەرفراوان کردنەوەیەی هێزی تاك بۆ زۆرداری و چەوساندنەوەی دیتران نییە، بەڵکو هێزو توانای تێگەیشتن و کەڵك وەرگرتن لە کاملترین پێوانە و توانا مرۆڤییەکانە.

بەباشم زانیوە کە لەم زنجیرە وتار-انەدا زیاتر لەوەی کە وەڵام بدەمەوە پرسیارم بکەم، دەزانم کە لە کردەوەدا وەڵامی شیاوم نەداوەتەوە. بەم پێیە باسی دەرەنجامێك دەکەم کە دەتوانرێ لەکاربگرێ.

به سیاسەتوانانی وڵاتی خۆتان بڵێین کە ڕێی ئازادانە و دروستی ژیان کە تاڕادەیەك بیریشیان لێنەکردۆتەوە، پەیوەستە بەوەی، کە نەتەوە ڕۆژئاواییەکان دەبێ نابەرابەریی مافە مرۆڤییەکانی نێوان نەتەوەی هەژار و نەتەوەی سەرمایەدار بنیات بنێیینەوەو قەرەبووی بکەنەوە.

تەنیا بەلایەنگری گشتی و یارمەتی زۆری ئابوورییە، کە نەتەوە هەژارەکان دەتوانن لە هاوسەنگی مرۆڤایەتی بگەن و بیناسن و ئێمەش دەتوانین هێزو توانای ئەخلاقی و دەسەڵاتە دیموکراسییە لیبراڵییەکان بپارێزین.



## پەراوێزەکان

1- The Life and times of Liberal democracy.

٢- مەبەستی نووسەر لە وێنەی زاڵ، هەمان لیبرالیزمی ڕۆژئاوایە.

3- Regulatory state دەوڵەتی چاوەدێریان

4- Trade- union Consciovsness.

5- Exreme choice.

6- Laissez – Faire.

7- J. M. Keynes: Essay in Persuasion (London, 1932)pp. 369-72.

